چاپی سێیەم

# گەنجان

لەنێوان

گرفتی سەردەم و چارەسەردا

هەوڵێك بۆدیاریکرن و چارەسرکردنی بەشێك لە

گرفتە کۆمەڵایەتیەکانی گەنجان بە دیدێکی سەردەمیانە




دکتۆر إدریس گاریتانی

# گەنجان لەنێوان گرفتی سەردەم و چارەسەردا

## نووسینی: د.إدريس كريم كاريتانى

## پێداچوونەوە: پرۆفیسۆر د.ئەحمەد موحەممەد بالیسانی



چاپی سێیەم ٢٠١٨ز - ١٤٤٠ك



**نوسینگەی تەفسیر**

بـۆچـاپ و بڵاوکـردنـەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

کاریتانی، إدريس كريم

گەنجان لەنێوان گرفتی سەردەم و چارەسەردا، إدريس كريم كاريتانى(نووسەر)

٢٣٤ لاپەڕە،

١٧* ٢٤ سم

بابەت، گەنجان، هزری ئیسلامی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢٠) ی ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین :عمر عثمان عمر

خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

هەڵەچن: عەبدوڵڵا زاهیر،کاک بەڵێن، کاک دیار



﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ ﴾

(الكهف:١٣)

﴿ قَالُوا مَن فَعَلَ هَذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴾

(الأنبياء:٥٩-٦٠)

## پێشکەشە:

- بە ڕوحی پاکی برای کۆچ کردووم مامۆستا سیف الـدین کـە بـەبێ بـاوك گـەورەی کردم.
- بە دایکی خۆشەویستم کە ژیانی خۆی لەسەر ئێمە دانا.
- بە کارزانی برام.
- بە هاوسەری بەڕێزم کە لە ژیانیدا هاوکاری زۆری کردووم.

سوپاس بۆ هەموو ئەو مامۆستا و برا بەڕێزانەی کە هاوکاریان کردووم و یارمەتیان داوم لە نووسینی ئەم کتێبە.

# پێشەکی چاپی سێیەم

تەکنەلۆژیای سەردەم و شارستانیەتی رۆژئاوا بەشێوازێك پێشکەوتوە خەریکە عەقڵ بۆی نەخوێندرێتەوە، توانیویەتی لەڕوی گەیاندن خزمەتێك بە مرۆڤایەتی بکات لە مێژودا نەکراوە و وینەی نەبوە، مروڤایەتی هەموو بەیەکەوە گرێ داوە و تەواوی سنوری جوگرافیای ولاّتانی بڕیوەو لەدەرگای هەموو ماڵێك دەچێتە ژورێ بەبێ ڕوخسەت وەرگرتن لەخاوەن ماڵ، تا گەیشتوّتە ئاستێك لەڕوی مادیەوە مرۆڤ بەئاسانی دەستی بکاتە هەموو زانیاریەك و لەگەڵ تەواوی زوبان و کلتورو شارستانیەت و روشەنبیری جیاوازی دونیا تێکەڵ ببێت و ئاڵوگۆڕی زانیاری و بازرگانی و بابەتەکانی تر بکات، لەگەڵ ئەم هەموو پیشکەوتنە بەداخەوە نەی توانیوە ماڵێکی ئارام و خێزانێکی بەختەوەر دروست بکات! بەپێچەوانەوە شوناسی میللەتانی بزر کردوەو کلتورو شارستانیەتی تەواو تێکەڵ کردوە، بەشێکی زۆری میللەتانی ژیردەستەی بێ شوناس کردوە، بەتەواوی لەکلتورو ئاداب و رەوشتی خویانی دور خستوتەوە، بەتايبەتی توێژی گەنجان زورترین زەرەر مەندن لەم سەردەمی عەولەمەو تەکنەلوژیایە، گەنجان لەرێی ئامێرە ئەلکترونیەکانەوە کەوتونەتە گێژاوی شەهوەت و رێی راستی خۆیان بزر کردوە، هیچ ئامانج و ئاواتێکیان نەماوە، یان بەهوی سەرقاڵی بە فیس بوکەکەیەوە نازانێ بۆچی دەژی و لەکوێ هاتوەو بۆ کوێ دەچێ، ئەم گرفتانەی پێش دە ساڵ بەرۆکی گەنجی دەگرت

بەتایبەتی گرفتی شەهوەت ئەگەر پیشتر (١٠٪) بو بێت ئیستا گەیشتوتە لوتکەو ریژەکەی یەکجار زیادی کردوە، گەنجی توشی سەرگەردانی کردوە، خێزانی هەڵوەشاندوەتەوە، شوناسی لەدەست داوە، ئەو کتێبەی بەردەستت بەشێکی زۆری گرفتەکانی گەنجانی بەوردی و بەشێوازی خالبەندی باسکردوە، دواتر بەوەندە نەوەستاوە دەست بەچێ چارەسەری تەواوی بۆ دوزیوەتەوە، توانیویەتی لەماوەی پێشوو گرفتێکی زۆری گەنجان چارەسەر بکات، بەشاهیدی خۆیان، سودێکی راستەوخۆ بەم توێژە بگەیێنێ، بۆ ئەم مەبەستە ئەم کتێبە لەئێستادا لەهیچ پەرتوکخانەیەك نەماوە بڕیارماندا بۆ چاری سێیەم چاپ بکرێتەوە بەئومێدی ئەوەی سودێکی زورتر بەم توێژە بگەیێنێ و ببێتە هەنگاوێکی تر بۆ بەندە لەرۆژی دوایی.

د - ادریس کاریتانی

٢٩ / ٨ /٢٠١٨. هەولێر.

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

لەم چەرخەدا، چەرخی زانست و ئینتەرنێت، چەرخی وێستگە ئاسمانیەکان و مووشەك ناردن بۆ مانگ و مەریخ، چەرخی بانگەوازی دیموکراسیەت و ئازادی، دیارترین دیاردەی گەنجان بیرکردنەوەیانە لەخۆیان، یا لە خەڵکان یا لە هەموو بونەوەر و دەوراوپشتیان، ئەم دیاردەیە بەم هێز و وزەی لاشەیی و هزری کە هەیەتی، لە بەهێزترین کات و حاڵەت دایە لەم بارەدا، پێویستە ئاراستە بکرێ بۆ ڕێی ڕاستی پەروەدەیی و هزری ڕەوشەن و بیری قوڵ و کاری بەفەڕ و هەوڵی وەبەرهێنەر و تەقەلای گەشەسەندن و ئاواتی کەڵك دان و خزمەت کردن، ئەگەرنا لاچەپ دەبێ و بۆ نەشیاوی و نێگەتیڤی دەڕوات.

بەلاّم ئەگەر بمانەوێ گەنج و لاو بەم شێوە شیاو و ڕاست و دروست بێ، دەبێ لێی نزیك بینەوە و بچینە ناو دەرونی و هەموو گیروگرفتەکانی بزانین، بۆ ئەوەی چارەی بکرێ و بکرێتە کەسێکی بە متمانە و بەهێز و ڕاست و دروست، تا بتوانێ لە ئاستی ئەوە دابێ کەڵکی هەبێ بۆ خۆی و میللەت و کۆمەڵگاکەی.

بۆیە کە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەخوێنینەوە دەبینین پڕە لەو ئایەت و فەرمودانەی دەروون و ناوەڕۆکی مرۆڤ وەدەردێخی و هەروەها گیروگرفتەکانی دیار دەکات و ڕێنمایی بۆ دادەنێ و چارەشی دەکات.

بەڕاستی ئەم کتێبەش کە لە بەردەستانە نووسەرەکەی هەوڵێکی زۆری داوەو دڵکاری کردووە بۆ دەست نیشان کردنی گیروگرفتەکانی گەنج و لاوان و

چارەسەرکردنی بەگوێرەی ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتی **پێغەمبەر** (ﷺ).

کات و هزر و زانست گرنگترین ڕێگاکانی وەبەرهێنان و گەشەسەندنە لەکۆمەڵگای جیهانی ئێستاماندا، کاتی گەنجی چاکترین کاتە بۆ ئەم ئەرکە چونکە مرۆڤ لەژیانی دا لەم کاتە لەهەموو کاتێکی تر بەری ماندووبوون پتر ئەگرێ زوو ماندوو نابێ، یەك لەم مامۆستا گەنجانەی لەم ئاستەدان و بڵێم نازانێ ماندووبوون و کۆڵدانەوە چییە لەڕێی خزمەتی بارەکانی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەو پێ ڕاگەیاندنی ئایینی خودا، مامۆستا ئیدریس کاریتانی یە، کە شارەزای بوویمە بەهۆی کارکردنمان بەیەکەوە لە گۆڤاری چرای ڕووناکی.

ئەم کتێبەی نووسیوەو خستوویەتە بەردەمی خوێنەرانی بەڕێز، هیوادارم کەڵکی لێ وەربگرن و بیکەنە بەرنامەی کارپێکردن بۆ پەروەردەو ڕێ پیشاندانی گەنجەکانمان و هێنانەدەرییان لەڕێیە لارولادەرە ترسناکەکانی ئەم سەردەمە. هیوادارم سەرکەووتوبێ و بەردەوام بێ بۆ وەبەرهێنانی تری بەسوود. خوا لێی قبووڵ بکاو بیخاتە تەرازووی چاکەکانی بۆ ڕۆژی دوایی.

پرۆفیسۆر د.شێخ ئەحمەد شێخ موحەممەد بالیسانی

هەینی ٢٠١٠/١/٨

## بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله تعالى من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله تعالى فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له. وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾

أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله تعالى، وأحسن الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

# پێشەکی چاپی یەکەم

تەوژمی بەدڕەوشتی و خراپەکاری لەم سەردەمەدا زەنگێکی ترسناکە بۆسەر توێژی گەنجان، ئەو هەڕەشە ترسناکانەی ڕوو لە کۆمەڵگاکان دەکەن، بریتی یە لە تێکدانی ڕێڕەو وبیر و ڕەوشتی دەستەبژێرێکی گاریگەر و بەتوانا، سەرئەنجام ئەم کۆمەڵگایە لێك هەڵدەوەشێتەوەو دەبێتە ژێردەستەی ولاَتان و خێروبێر و سامانی ولاَتەکان بە تالاَن دەبردرێت و خزمەتی بێگانەی پێ دەکرێت، بۆیە بەدرێژایی مێژوو کار لەسەر چین و دەستەبژێری تایبەتی کراوە کە بناغە و بنچینەی پێشکەوتن و شارستانیەت و ڕۆشنبیری بووینە، لایەنێك کارێکی لەسەر ئەم توێژە کردووە بۆ ئەوەی بەکاری خۆیان هەڵسن و ولاَتان بەرەو پێش ببەن و گەلانی دونیاش پێ بحەسێنەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) بەماوەیەکی زۆرکەم توانی ئەم چینە بەچاکترین شێوە پێ بگەیەنێ و ئیسلام لەسەر شانی ئەوان دابمەزرێنێ وەنەبێ هەر بۆ خۆییان بەڵکو جیهان بەگشتی، ئەو شوێنانەی ئیسلامیان پێ گەیشتبێ بە تەواوی بکەونە خۆشی و ئارامی، وەك (ڕەبعی کوڕی عامر) فەرمووی: (ان الله ابتعثنا لنخرج العباد من عبادة العباد، الی عباد الله الواحد القهار ومن ضیق الدنیا الی سعة الد نیا والاخیرة) واتە:خودای گەورە ئێمەی ناردووە بۆ ئەوەی بەندەکان لە بەندایەتی بۆ مرۆڤ دەربهێنین بۆ بەندایەتی خودای تاك و تەنها وە لە تەسك و تەنگەبەری دونیا بۆ فروانی دونیاو دواڕۆژ. ئەو دەستەبژێرەش چینی گەنجانن! چونکە بەشی زۆری ئەوانەی لە دەوری پێغەمبەر بوون (ﷺ) گەنج بوون. ئەو لایەنەشی کە بەردەوام بیر لەوە دەکاتەوە خەڵك بکاتە کۆیلەی خۆی و خێروبێری هەموو جیهان بۆ خۆی

ببات، بەدرێژایی مێژوو لەسەر ئەم ڕایە خەڵکی ڕاهێناوە و داوای خودایەتی کردووەو خەڵکی بە بەندەی خۆی زانییوە، کاری لەسەر دەستەی گەنجان کردووەو لەڕێی گوماناوی و هەوەسبازی هەڵی خەڵەتاندوون، کۆمەڵێك گرفتی بۆ دروست کردوون، بەدوای ئەوەدا گەڕاون هۆکارێك بدۆزنەوە گەنجانی پێ بێ هۆش بکەن و بەتەواوی لە ڕێی ڕاست دووریان بخەنەوە! چەندین گرفتی بۆ دروست کردوون لە ناو بەرگی جوان و بریقەدار و ڕازاوە ﴿بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ﴾ (الحديد: ١٣) واتە: ڕووی ناوەوەی ڕەحمەتی تیایەو دەرەوەشی ڕووی لە سزایە. وەك ناشیرین کردنی ژن هێنانی شەرعی و جوان کردنی زینا، نێربازی، مەی خواردنەوە، ڕێکلامی فیلمی ڕووت، چونە دەرەوەی وولآت بۆ خزمەت کردنی کافران، خراپ بەکارهێنانی مۆبایل، تریاك خواردن و چەندینی تر گەنجانی پێ گیرۆدەبوون و عەقڵ و هۆشیان لە دەست داوە، نازانن بۆچی دەژین! ئامانجیان چی یە، بەرەو کوێ ڕێدەکەن، لە خزمەتی کێ وایان لێ هاتووە، خۆیان و خێزان و کۆمەڵگایان بەرەو هەڵدێر بردوون و لە دەستیان داون، بوونەتە گەمەی بەردەستی دوژمنان، هەر ڕۆژەی بە شێوازێك تاقیان دەکەنەوە، چۆنیان بوێ ئاوایان هەڵدەسووڕێنن.

ئینجا بۆ ئەوەی تاکی کورد خۆی و خێزانی و کۆمەڵگاکەی لە نێو نەبات، بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە زۆرینەی نەخوێندەوار و ناشارەزان و زۆر کوێرانە لاسایی کوفر و جێ بەجێکاری پیلانەکانی دوژمنن، دەبێ هەنگاو بەرەو هۆشیارکردنەوە بنێین. لە ئەنجامی تێکەڵ بوونمان لەگەڵ گرفتی گەنجان بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمەڵگای ئێمەش کەوتۆتە بەر ئەم هەڕەشە ترسناکە و تا قوڕگی هاتووە، ئەگەر چارەسەرێکی بە پەلەی بۆ نەدۆزینەوە ئەوا ئێمەش چارەنووسمان وەك ئەم گەلانە دەبێت کە دارمانی ڕەوشت لە ناوی بردوون و کەوتوونەتە بەر ڕق وکینی خوداو ناخۆشی و دەردەکانی ژیانی دونیا. لەبەر ئەم هۆیە بە پێویستم زانی

لەگەڵ کەمی زانیاری و زانستیشم لەڕێگەی قەڵەمەکەمەوە خزمەتێکی کەم بەم گەنجانە بگەیێنم و سەرەتا گرفت و هۆکارەکەی باس بکەم و دواتر لە قورئان و فەرموودە بە سوودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و ووتەی زانایانی بەڕێز چارەسەری بۆ بدۆزمەوە. بۆ ئەوەی گەنج ئەگەر تووشی گرفتێك بوو بتوانێ بەبێ پرسیار و وەڵام چارەسەری خۆی لێرە بۆ بدۆزێتەوەو بە ئاسانی خۆی دەرباز بکات. ئەوەی پێکابێتم و ڕاستم گووتبێ ئەوا لە خوداوەیە و ئەوەی هەڵەشم کردبێ لە خودی خۆم و لە شەیتانەوەیە. داوا لە خودای گەورە دەکەم لێم ببورێ، بەهیوای ئەوەی بتوانم سوودێکی کەم بە خوشك و برا گەنجەکانم بگەیێنم (ان شاءالله).

د. ئیدریس کەریم کاریتانی

پێش نوێژ و ووتار خوێنی مزگەوتی (الله اکبر)

هەولێر - ٢٠١٠/١/١

# پێشەکی چاپی دووەم

بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای سەردەم و دونیای جیهانگەرایی ڕۆژانە جیهانی ئیسلامی و موسڵمانان ڕووبەڕووی جۆرەها شالاو دەبنەوە، هەیانە سوودبەخشە وەبەشێکی زۆریشی زیانبەخشەو زیانی زۆر لە کۆمەڵگای موسڵمانان دەدات، بەتایبەتی لەچین و توێژی گەنج بەهەردوو ڕەگەزی (نێرومێ). گومانی تێدا نییە گرفت و کێشەی گەنجان زۆر ترسناکە، دەبێ بەهەموو توانایەك بەرپەچ بدرێتەوەو چارەسەر بکرێ، چونکە کاریگەری تەواو لەسەر کۆمەڵگا دەکات و بەرەو لەناوچوونی دەبات. دیارە لادان و خراپ بوونی گەنجان لەناخی خۆیان دانییە، بەڵکو کاتێك گەشە دەکات زۆر پاکە، بەڵام ژینگە و دەوروبەر و کۆمەڵگا و دایك و باوك دەسەڵات و نەبوونی پەروەردەی دروست و ڕاگەیاندنەکان و کەمی ئامۆژگاری ئایینی ...هتد، وادەکات گەنج تووشی جۆرەها گرفت بێت، دواتر هەوڵ دەدات و چارەسەری دەست ناکەوێت، تا لەنێو گۆم و لێلاوی گوناه نوقم دەبێت.

ئەم بۆچوونە لەخۆمەوە نەمگوتووە بەڵکو بەهۆی ئەوەی من لەنێو گەڕەکێکی پڕ لە کێشەو گرفتی گەنجانم، ڕۆژانە چەندین گرفتی ناخۆش و پڕ ئێشی گەنجان دەبیستم کە تووشی هەڵەبوونەو بەچاوی فرمێسکەوە داوای چارەسەرو گەڕانەوە دەکەن. کاتێك دەستیان دەگری ئەوا بەپەرۆشەوە ڕوو لە گەڕانەوە بۆ لای خودا دەکەن و نەفرەت لە ڕابردووی پڕ گرفت و گێژاوی گوناه دەکەن، کەواتە گەنجان پێویستیان بەدەست گرتن و یارمەتی هەیە.

کاتێك ئەم چەند گرفتەم لە چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا باس کرد، بێ گومان بووم لەوەی کە کەمێك سوودی بۆ گەنجان دەبێ، تاڕادەیەك گرفتی هەندێ لە گەنجان چارەسەر دەکات، بەڵام سوپاس بۆ خودای گەورە بەرێژەیەك گەنجان

ڕوویان لەم کتێبە کرد کە پێشبینی نەدەکرا. دواتریش بەشێك لەمامۆستایانی بەڕێزی وتارخوێن ئاماژەیان بەوە کرد کە سوودمان لێ بینیوە. هەر ئەم هۆکارانە بوونە هۆی ئەوەی کە بۆ جاری دووەم بڕیاری چاپ کردنەوەماندا، ئەمە سەرەڕای هەڵەچنی کردن و چەند وردەکارییەك لە ناوەڕۆکی کتێبەکە کە برای بەڕێزم (مامۆستا عەبدوڵلا) گرتیە ئەستۆ.

وە جگە لەم هۆکارانە وەك لەپێشدا ئاماژەم پێکرد، ڕۆژانە گەنجانی دەوروبەرمان تووشی جۆرەها گرفتی ناخۆش و ترسناك دەبن و لەڕێگەی تەلەفۆن ئاگادارم دەکەنەوەو داوای چارەسەر دەکەن، یەکێك لەوانەی کە زۆر کاری لێ کردم و دڵی ئازاردام ئەوەبوو کە گەنجێك لە تەلەفۆن پێی گوتم، من هاوڕێیەکەم هەیە دەستی لەگەڵ ئافرەتێك تێکەڵ کردووە، ئەم ئافرەتە پێشتر منداڵی نەدەبوو بەڵام ئێستا (سکی) لە هاوڕێکەی من هەیە. داوای لە من کردووە کە دەرزییەکی پێ بدەم بۆ ئەوەی منداڵەکەی پێ بکوژم، ئەگەرنا ئەوا ئاشکرا دەبێت و کوڕەکە دەکوژرێت! جا چارە چییە؟! .

ئەم ڕووداوە و چەندین ڕووداوی تر و لەگەڵ ئەم هۆکارانەی سەرەرەوە بەیەکەوە وایان کرد بەپێویستی بزانین ئەم کتێبە جارێکی تر بخەینەوە بەردەستی گەنجان. بەئومێدی سوود وەرگرتنیان و دەست کەوتنی چارەسەر بۆ گرفتەکانیان،

وەمنی بەندەی بێ هێزی خزمەتکاری شەریعەتی ئیسلام، داوا لە بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی دەکەم کە لێمی قبوڵ بکات و بیکات بە توێشووی ڕۆژی دواییم.

د. ئیدریس کەریم کاریتانی

پێش نوێژو وتارخوێنی مزگەوتی (الله اکبر)

هەولێر- ٢٤ی ڕەجەب ١٤٣٢ ك – ٢٥ی حوزەیرانی ٢٠١١

# هۆكاری نووسینی ئەم كتێبە

نووسینی ئەم كتێبە هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ چەند لایەنێك، یەكێك لەوانە گرنگی گەنجان، كە گەنجانمان لە كۆن و ئێستادا، لەهەموو شۆڕش و گۆڕانكاریەكاندا بناغە و سەرمەشقی گۆڕانكاریەكان بووینە، هیچ بیرۆكەیەك لەدونیادا ناگاتە ئامانج تاوەكو پێنج بنچینەی گرنگی بۆ ئامادە نەكرێ ئەویش بەهێزی بیرۆكەی كەسایەتیەكە، بڕوای تەواو بەم بیرۆكەیە، دڵسۆزی بۆ ئەم بیرۆكەیە، جۆشوخرۆش و گەرم وگوڕی بۆ ئەم بیرۆكەیە، خۆبەخت كردن و قوربانیدان بۆ ئەم بیرۆكەیە. ئەم پێنج ڕەوشتە گشتیان لە گەنجاندا هەن! دڵپاكی و دڵسۆزی و گەرم و گوڕی و خۆبەخت كردن لە تایبەتمەندی گەنجاندایە، بەلاّم لە هەمان كاتدا زۆرترین گرفت لەم سەردەمەدا تووشی گەنجان دەبن، شەپۆلی خراپەكاری ئەمڕۆ زیاتر ڕووی لە گەنجانە، زۆربەیان بە ووتەی بریقەدار و گومانـاوی و هەوەسبازی گیرۆدەبوون، ڕێگایان بزركردووەو ئامانجیان دیار نییە، لە سەرگەردانی دەژین، بەشێكیان تووشی گیروگرفتی كۆمەلاّیەتی بووینە، بەشێكیان بەرەو هەنداران ڕۆیشتوون، بەشێكیان بەهۆی ماددەی بێ هۆشكەر كەوتوونەتە بەندیخانەكان ...هتد، بۆیە بە پێویستمان زانی كە گرفتەكانی سەردەم باس بكەین و هۆكارەكانی دیاری بكەین دواتر بۆ هەر گرفتێك چارەسەرێكی گونجاوی بۆ بدۆزینەوە لەپێناو خزمەتكردنی ڕۆڵەكانی گەلەكەمان.

## گەنجان کێن؟

گەنجیێتی قۆناغێکە لە قۆناغەکانی تەمەن کە مرۆڤ پیایدا تێپەر دەبێ، کەلە ١٥ ساڵی دەست پێ دەکات ولە ٤٠ ساڵی کۆتایی دێت. چونکە گەشەی تەمەنی مرۆڤ لە ٤٠ساڵیدا تەواو دەبێت، بۆیە ووشەی (الشباب) لە زمانەوانیدا بەمانای گەشە (نما) و هێز (قوة) لێکدراوەتەوە، خودای گەورەش لەبارەیەوە دەفەرموویێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةً ﴾ (الأحقاف: ١٥) واتە: هەتا کاتێك مرۆڤ دەگاتە حاڵەتی توندوتۆڵی و توانایی و تەمەنی ٤٠ ساڵی، هەروەها (ئیبن کەثیر) دەفەرموویێت: (تناهی عقلە وکمل فهمە) واتە: تەواوی عەقڵ و تێگەیشتن.

## گرنگی قۆناغی گەنجایەتی

ئەم قۆناغە لە تەمەن بەگرنگترین قۆناغ دادەنرێت لەبەر ئەم هۆیانە.

**یەکەم: تەمەنی هێز و بەرهەم هێنانە:**

مرۆڤ لە درێژەی ژیانیدا بەچەند قۆناغێك تێدەپەڕێ، قۆناغەکانیش جیاوازن سەرەتا دێتە دونیاوە بچووك و بێ هێزەو نەزانە، دواتر گەورە دەبێت و گەشەدەکات هێز و زانستی زیاد دەبێت. ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾ (النحل:٧٨) واتە: (خودای گەورە بەندەکان لەنێو سکی دایکان دەردەهێنێ و هیچ نازانن گوێیان پێدەدات بۆ بیستن چاویان پێدەدات بۆ بینین عەقڵیان پێ دەدات بۆ جیاکردنەوەی باش و خراپ لەیەکتر، بەلاَم قۆناغی گەنجیێتی درێژە ناخایەنێ بەڵکو بەرەو بێ

هێزی دەچێتەوە، هەروەکو خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٖ قُوَّةٗ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٖ ضَعۡفٗا وَشَيۡبَةٗۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡقَدِيرُ ﴾ (الروم:٥٤) واتە: (خوا ئەو زاتەیە ئێوەی بە لاوازی دروست کردووە (سەرەتا نوتفەیەکی لاواز، دوایی وەك دیل لە سکی دایکدا، پاشان هەر منداڵی لاوازیت تا دەگەیتە تەمەنی لاوی)، ئەوسا خوا هێز و دەسەلاتێکت پێ دەبەخشێت، دوای هێزو توانایی دووبارە نۆرەی لاوازی و پیری دێت، بێگومان ئەو خوایە هەرچی بوێت دروستی دەکات (ئەم هێزو بێ هێزییە بەشێکە لە ویستی ئەو زاتە (ئەو پەروەردگارە زانا و بە توانایە).

ئەم قۆناغە قۆناغی هێز و بەرهەم هێنانە، قۆناغی پێشکەوتنی ڕۆشنبیری و زانستییە لە هەموو کات و ساتێکدا زیاتر لەسەر شانی ئەوتوێژەیە.

**دووەم: چاکترین قۆناغی تەمەنە:**

ئەم قۆناغە چونکە قۆناغی هێز و گەشەیە، زیاتر تام وچێژی پێوە بەندە خۆشیەکان زیاتر لەم قۆناغە تام دەکرێت و هەوڵی بۆ دەدرێت! بچوك هیوای گەنجییێتی دەخوازێت و پیریش خۆزگەی بۆ دەخوازێ! بۆیە خودای گەورەش کاتێك پاداشتی بەهەشتیەکان دەداتەوە لە بەهەشت باوەرداران دێنە سەر تەمەنی گەنجییێتی کە **٣٣** ساڵە و هیچ کەس لە قۆناغی پیری و منداڵی نامێنێ.

**سێیەم: تەمەنی مرۆڤ زۆربەی خەڵك لەنێوان ٦٠-٧٠ ساڵی دایە و کۆتایی پێدێت:**

وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((اعمار امتي بين الستين و السبعين واقلهم من يجوز ذلك))[1]. واتە: تەمەنی ئومەتی من لەنێوان شەست تا حەفتا

[1]. اخرجه الترمذي في سننة

ساڵە، کەمێکیان لەوە تێدەپەڕن. کەواتە تەمەنی منداڵی دەست پێ دەکات لە لەدایك بوونەوە تا دەکاتە ١٤ساڵی، تەمەنی گەنجییێتی لە ١٥ ساڵی تا دەگاتە ٤٠ ساڵی و تەمەنی جوامێری (کهولە) لە ٤١ ساڵی تا دەگاتە ٥٠ ساڵی و تەمەنی پیرو پەککەوتە لە ٥٠ ساڵی تا دەگاتە مردن. تەمەنی گەنج زۆرترین و درێژترین بەشی بەرکەوتووە لەتەمەن کە دەکاتە ٢٥ ساڵ.

**قۆناغەکانی تەمەن**

| قۆناغ | ساڵەکانی تەمەن | ڕێژەی تەمەن بەسەدا |
|---|---|---|
| منداڵی | لەدایکبوون -١٤ساڵی | ٢٢٪ |
| گەنجییێتی | لە ١٥-٤٠ ساڵی | ٤٠٪ |
| جوامێر (کهولە) | لە ٤١-٥٠ ساڵی | ١٥٪ |
| بەساڵاچوو (شیخوخە) | لە٥١- تا مردنی | ٢٣٪ |

**ئەم شێوازە دابەشکردنەی تەمەن زیاتر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدی دەکرێت.**

چوارەم: گەنجان کۆڵەگەی هەموو گەلێکن:

گەنجان لە سەرتاسەری جیهان کۆڵەگەی پێشکەوتن و شارستانیەتن سەرچاوەی بەخشین و خۆبەختکردن و هاوکارین، زۆربەی وولاتە پێشکەوتووەکان کە مێژوویەکی پڕشنگداریان تۆمارکردووە ڕێژەی گەنجانیان زۆرە.



# پلەوپایەی گەنجان لەئیسلامدا:

## گەنجان لە قورئاندا:

قورئان پڕە لە هەڵوێستی ئەوگەنجانەی کەلە ڕێی ئایینی خودا ڕووبەڕوو بوونەوەیان لەگەڵ ستەمکارو زۆرداری سەردەم ئەنجام داوە. وەك پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەربێ) کە هەڵدەستێ بەشکاندنی بتەکان. هەروەکو خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴾ (الأنبياء:٥٩=٦٠) واتە: (بت پەرستان (کە هاتنەوە بینیان بتەکانیان وردوخاش کراوە) گوتیان: ئەوەی ئەمەی کردووە بە خواکانمان، بەڕاستی لە ستەمکارانە، هەندێکیان گووتیان: بیستومانە لاوێك بە خراپە باسیان دەکات پێی دەڵێن ئیبراهیم).

هەروەها خودای گەورە باسی کۆمەڵێك گەنجمان بۆ دەکات کە چۆن بەرامبەر گەورەترین زۆردار و دەسەلاتداری ئەو سەردەم وەستاون و وشەی حەق و یەکتایی خودای گەورەیان لەبەرچاوی زۆرینەی خەڵك ڕاگەیاندووە ئەمانیش گەنج بوون وەك دەفەرموویێت: ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴾ (الكهف:١٣–١٤) واتە: (ئێمە بەڕاستی و دروستی هەواڵی بەسەرهاتی ئەو لاوانەت بۆ دەگێڕینەوە، بەڕاستی ئەوانە لاوانێك بوون باوەڕی دامەزراویان هێنابوو بە پەروەردگاریان، ئێمەش زیاتر لە نووری ئیمان و هیدایەت بەهرەوەرمان کردن. ئێمەش دڵەکانیانمان دامەزراو کرد و ترسمان تێدا

نەهێشت (بڕیاریاندا کۆمەڵگەی نەفامی بەجێبهێڵن) کاتێك هەستان و وتیان: پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، هەرگیز هانا و هاوار بۆ هیچ خوایەکی تر نابەین جگە لەو، ئەگەر لەو ڕاستیە لابدەین، سوێند بە خوا ئەوە بێگومان ئێمە لەو کاتەدا قسەی نابەجێ و نادروستمان کردووە.

## گەنجان لەفەرموودەی پێغەمبەردا:

پێغەمبەر (ﷺ) گرنگییەکی زۆری بە گەنجان داوە، لەهەموو لایەنەکان هانی داون، لەچەندین فەرموودە دا فەزڵی ئەوانی خستۆتەڕوو وەك دەفەرمووێت: ((ان الله ليعجب من الشباب الذي ليس صبوة))[1] واتە: خودای گەورە (موعجەبە) بە گەنجێك کە لە گەنجییێتی هەڵەی نەکردبێت. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) گەنجان هاندەدات بۆ بەدەست هێنانی باشترین پلە لە مەیدانی مەحشەر و دەفەرموێت: ((سبعة يظلهم الله في ظله يوم لاظل الا ظله)) یەك لەوانە (شاب نشأ في عبادة الله) (رواه الشيخان) واتە :حەوت کۆمەڵ هەن لەڕۆژی دوایی لەژێر عەرشی خوا ڕادەوستن یەکێك لەم کۆمەڵانە گەنجانێکن ژیانی خۆیان بە خواپەرستی بەسەربردووە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) بانگی گەنجان دەکات بۆ ئامادەکردنی خۆیان لەڕووی جەستە و عەقڵ و ڕەوشتەوە کە ئەم کاتانە بەگرنگ وەربگرێ، وەك دەفەرموێت: ((اغتنم خمسا قبل خمس حياتك قبل موتك و صحتك قبل سقمك، وفراغك قبل شغلك، وشبابك قبل هرمك، وغناك قبل فقرك))[2]. واتە: گەنجایەتیەك بە دەستکەوت بزانە، پێش ئەوەی پیری بێ ڕێت پێ بگرێ، نەتوانی

[1]. رواه احمد و ابو يعلي
[2]. رواه الحاكم

ئەم دەستکەوتە بەدەست بهێنی. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) گەنجان ئاگادار دەکاتەوە بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە لەبەرامبەر پەروەردگاری جیهانیان وەك دەفەرموێت: ((لا تزول قدما عبد يوم القيامة حتي يسأل عن اربع، عن عمره فيما افناه، وعن شبابه فيما ابلاه، ومن ماله من اين اكتسبه و فيما انفقه، وعن علمه ماعمل فيه))[1] واتە: بەندە لە ڕۆژی دوایی پێیەکانی هەنگاو ناهاوێژێت تا لە چوار شت لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرێت، تەمەنت لەچی بەسەر برد، لێپرسینەوە لە تەمەنی گەنجی لەدونیادا بەچیت بەسەر برد، چۆنت بەسەر برد، بۆ ئیسلام یان ڕازی کردنی هەواو هەوەسی خۆت، وەماڵەکەت چۆن بە دەست هێناو لەچیت خەرج کرد.

**ئەی گەنج:**

ئەی گەنج ئەوەت لەبیرنەچێ پێغەمبەران کە هاتوون گەنج بوون توانییان ڕێرەوی جیهان بگۆڕن بەشی زۆری ئەوانەی سەرەتا باوەڕییان بەپێغەمبەران هێناوە گەنج بوون، ئەبوبەکر کە باوەڕی هێنا **٣٧** ساڵ بوو، عومەر **٢٧** ساڵ و، عوسمان بچوکتر و عەلی لەو بچوکتر عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و تەڵحە و زوبێر و سەعد و سەعید و بیلال و سوهەیب و عەمار و ئەرقم هەموویان گەنج بوون.

**ئەی گەنج:**

بە **٣٥** ساڵی خەلافەتی ڕاشدین لەسەر شانی ئەم گەنجانە ئالاّی ئیسلام لە ڕۆم و فارس و شام و عێراق و میسر و تەرابلس و باکوری ئەفریقیا هەڵکرا.

---

[1]. رواه الترمذي

**ئەی گەنج:**

لەسەردەمی ئەمەویەکان لەسەر دەستی گەنجان زۆربەی ولاَتی هند و تورکستان و ڕۆژهەلاَتی چین و ڕۆژئاوای ئەندەنوسیا ئالاَی ئیسلامی لیَ هەلَکرا.

**ئەی گەنج:**

ئەوە عوقبەی کوڕی نافعە و گەنجێکە ئیسلامی گەیاندە (زەریای ئەتلَەسی) و لەوێوە گەیشتە سەر زەریا فەرمووی: ((اللهم رب محمد لولا هذا البحر لفتحت الدنيا في سبيل اعلاء كلمتك، اللهم فاشهد)) واتە: ئەی خوایە ئەگەر ئەم (بەحرە) نەدەبوو دونیام لەپێناوی بەرزکردنەوەی ووشەی (لااله الا الله) ئازاد دەکرد، خودایە شاهیدبە.

## تایبەتمەندیەکانی قۆناغی هەرزەکاری _ گرفت و چارەسەر:

لەم کورتە باسەی پێشوو باسی قۆناغ و تەمەنی گەنجانمان کرد، لەم بەشەش باسی جۆرەکانی گەنج دەکەین و لە ناو ئەوانیشدا قۆناغی هەرزەکاری. گەنجان بەپێی ئاستی خوێندن و کار و ئایین و جوگرافیا دابەش دەبن بۆ ئەم بەشانە:

**یەکەم: بەشەکانی گەنج لەسەر بنەڕەتی فێرکردن** (التعلیمی):

١.**جۆرێك لەگەنجان ڕۆشنبیر و خاوەن شارەزایین:** ئەم جۆرە لەجۆری هەڵبژێردراو (قیادی) دەژمێردرێت، کاریگەریان هەیە بەسەر جۆر و چەشنەکانی تریش لە گەنجان.

٢. **جۆرێکی تر لە گەنجان هۆشیارو هۆشمەندن:** ئەم جۆرەش هەندێك زانستیان هەیە و هۆشمەندن، بەڵام لەڕووی چالاکی و کارکردن، بێ بەرهەم و کەم جوڵاون.

٣. **جۆرێکی تر لە گەنجان شوێنکەوتەو پاشکۆن:** ئەم جۆرەیان زۆرینەن، هۆشیاریان هەیە، بەڵام بەشداری چالاکی ناکەن و چاویان لەوەیە یەکێك بێت دەستیان بگرێ و ئاراستەیان بکات.

٤. **جۆرێکی تر دەستەی قوتابیانن:** ئەم جۆرە قوتابیانی ناوەندی و ئامادەیی و پەیمانگا و کۆلێژ و خوێندنی باڵا دەگرێتەوە، ئەم جۆرە لەبەر شوێنەکەیان بەشێکی زۆری گەنجان لەخۆدەگرێ و ئامادەییان تێدایە بۆ هەرکارێك کەپێیان بسپێردرێت.

دووەم: **دابەشبوونی گەنجان لەسەر بنەڕەتی کارو پیشە:**

**١. جۆری کرێکار و کاسبکار:** ئەم بەشەش زۆرینەن لەناو کۆمەڵگا ئەگەر دامو دەزگای تایبەت هەبێ باشترین کاریگەریان دەبێ.

**٢. جۆری فەرمانبەران:** ئەم چەشنە ئاست و گوزەران و پیشەیان جیایە.

سێیەم: **دابەش بوونی گەنجان لەسەر بنەڕەتی ئایینی:**

١. جۆرێك لەم گەنجانە ئایینێکی دیاریکراویان هەیە، ئەم جۆرە پابەندن بە ئەرکەکانیان و بیروباوەڕێکی تەواویان هەیە خاوەنی بەها و ڕەوشت بەرزن.

٢. جۆرێکی تر لەم گەنجانە ئایینی دیاریکراویان نییە، ئەم جۆرە باوەڕییان بە ئایین هەیە، بەلاّم بێ هێزن دەستگر نین بە دروشمەکانی ئایین و پارێزگاری لێ ناکەن.

٣. جۆرێکی تر لە گەنجان گۆڕاون و لەسەر ئایینی بنەڕەتی خۆیان نەماون بەهۆی پەیدابوونی بیروباوەڕی تر لەسەر ئایینەکەیان نەماون، تەواو بێ بڕوابووینە.

لەم دابەش کردنە جۆرێکی تر هەیە ترسناکترین و بەگرفتترین جۆرە، ئەویش هەرزەکارە، قۆناغێکە لە منداڵی بۆ هەرزەکاری بە زیادبوونی گەشەی لاشە و زایەندی(جنسی) و فیسیۆلۆجی و عەقڵ و هەڵچوون و ڕەوشتی هەرزەکاری خۆی دەسەلمێنێ.

# هەرزەکار (المراهقە) مانای چییە

ووشەی (المراهقە) دەگەڕێتەوە بۆ فرمانی (راهق) واتە نزیکبونەوە لەشتێك، (راهق الغلام) واتە نزیکبۆوە لە (احتلام) بوون. (المراهقە) لەلای زانایانی دەروونناس بە مانای نزیکبونەوە لەپێگەشتنی لەش و (جنس) و عەقڵ ...هتد) دێت.

## قۆناغەکانی هەرزەکاری:

ماوەی قۆناغەکانی هەرزەکاری لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێت، لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر جیاوازە. بۆیە زانایان دابەشیان کردووە بەسێ بەش:

١. قۆناغی هەرزەکاری سەرەتایی (لە ١١ساڵی تا ١٤ ساڵی یە).

٢. قۆناغی هەرزەکاری ناوەند (لە ١٤ ساڵی – ١٨ ساڵی یە)

٣. قۆناغی هەرزەکاری دواکەوتە (متأخر) (لە ١٨ ساڵی تا ٢١ ساڵی یە).

## نیشانەکانی سەرەتایی لە قۆناغی هەرزەکاری:

بەشێوەیەکی گشتی قۆناغی هەرزەکاری سێ نیشانەی سەرەکی هەیە

**یەکەم:** گەشەکردنی لاشەی، لەم قۆناغەدا لاشەی گەشەدەکات و درێژ دەبێت و هێزی زیاد دەکات، ماسولکەکانی بەهێز دەبن.

**دووەم:** لەڕووی (جنیسیەوە) پێدەگات، لەم قۆناغەدا نیشانەکانی (جنسی) لەنێر و مێ دەردەکەوێ، وەك مووی ڕیشی و بن هەنگڵ و شوێنەکانی تر لە کوڕان و هاتنی مەمك هەندێك زیپکە و شتی تر لە کچان.

**سێ یەم:** گۆڕانی دەرونی، لەگەڵ زیادبوونی هۆرمۆنەکانی لاشەی هەرزەکار گەشەی لاشەی ڕاستەوخۆ هەڵسوکەوتی دەگۆڕێت گۆڕانکاری تەواوی بەدی دەکرێت.

## گرفتەکانی هەرزەکار:

زانایانی دەروونناسی پێیان وایە گرفتی هەرزەکاری لەولاتێکەوە بۆولاتێکی تر و، لەکۆمەڵگایەکەوە بۆکۆمەڵگایەکی تر، لەشار بۆ لادێ لەکۆمەڵگەی پابەند لەگەڵ کۆمەڵگای بەرهەڵدا جیاوازە، بۆیە هەرزەکاران جیاوازن:

**یەکەم:** هەرزەکاری بێ گرفت و کێشە

**دووەم:** هەرزەکاری گۆشەگیر و داماو

**سێیەم:** هەرزەکاری ستەمکارو توند وتیژ

گرفتی هەرزەکاری بەشی سێ یەم، هەرزەکاری ستەمکار و توندیژ، ئەم گرفتانەی هەیە.

**١. ململانێی ناوخۆ (الداخلی):** لەم قۆناغە گرفتی یەکەمی بە ململانێ دەست پێ دەکات، سەرتا دەیەوێت لەناو خێزانەکەی دا سەربەخۆبێ، خواست و داواکاری زۆرە، ململانێ رۆشنبیری لەگەڵ دەوروبەرو کۆمەڵگا دەکا.

**٢. تێك نەگەیشتن لەگەڵ دایك و باوکی:** هەرزەکار لەگەڵ دایك و باوکی تێك ناگەن، پێی وایە ستەمی لێ دەکەن و ئەویش لەوان شارەزاترە.

**٣. لەکاتی گرفت شەرم دەیگرێ:** هەرزەکار کاتێك تووشی گرفتێك دەبێ شەرم دەکات لەگەڵ دایك و باوکی ئەم گرفتە چارەسەر بکات بۆیە پەنا دەباتە بەر دۆستەکانی یان گرفتەکەی بۆی چارەسەر ناکرێت یان زیاتر دەبێ.

**٤. هەڵس و کەوتی نارێك:** هەرزەکار لەم قۆناغەدا هەڵس و کەوتی نارێك ئەنجام دەدات، بۆ بەدەست هێنانی ئاواتەکانی، هاوار دەکات، جنێو دەدات و جاری واهەیە شت دەدزێ، لە منداڵان دەدات، ململانێ لەگەڵ گەورەکان دەکات ماڵ لەنێو دەبات، ڕەچاوی هەستی ئەوانی تر ناکات.

**٥. دەمارگیر و توندڕەوە:** هەرزەکار هەر داوایەکی هەبێ دەیەوێ بەتوندڕەوی بەدەستی بهێنێ، چونکە لێکۆڵەرەوان دەڵێن لەم تەمەنە هۆرمۆنی زیاد دەبێ و لەگەڵ هەست و سۆزی کارلێك دەکات و توندوتیژی لێ پەیدا دەبێ.

**٦. هەڵەی (جنسی) دەکات:** هەرزەکار کاتی پەیدابوونی (غەریزەی جنسی) تووشی هەڵەی (جنسی) دەبێ زۆرجار لەگەڵ نزیکترین کەسی خۆی! بەهۆی بێ بەرنامەیی خێزان، هەرزەکاریش مانای حەرام و شەرع و ئاداب کەمتر شارەزایە.

## ڕێڕەوە و بنەمـاکـانی پەروەردەی ئیسلامی:

تێڕوانینی قوتابخانـەی هـزری و فەلسـەفیەکان لـەنێو گـەل و میللەتانـدا، لەکۆن و ئێستادا، بۆ بەدەست هێنانی ژیانی ئاسوودەیی بۆ مرۆڤەکان زۆر جیـاوازە لەگەڵ بەرنامەی ئیسلام، هەیانە پێیان وایە ئـەم ئاسـودەی و خۆشـیانە تـەنها بـۆ ڕۆحەو لەسەر حیسابی (غەریزەی) لاشەیی (الغرائز الجسدیە)، هەیانـە پێیـان وایـە خۆشیەکانی مرۆڤ لەدونیا، لە ماڵ و هەوەسبازییە لەسەر حیسابی مەعنەویەکـەی! ئەمانە هیچیان ڕێی تەواوی خۆشی یەکانیانی بۆ مرۆڤ نەپێکاوە، چونکە بـەردەوام لایەنێك لەسەر حیسابی ئەوی تر تێربووە.

بەلاّم ئیسلام گرنگییەکی زۆری بەکەسایەتی مرۆڤ داوە بۆ وەدەست هێنان و چەشتنی هەموو خۆشیەکانی ژیـان بەهـەموو لایەنێکـەوە، مـادی و مەعنـەوی و ڕۆحی و عـەقڵی هەریەك لەوانە کاریگەریان لەسەر ئەوی تریـان هەیـە هەریەکـەیان هاوسەنگی ئـەویتر ڕادەگـرێ و هاوکـاری دەکـات، لـەناو مرۆڤەکانیشـدا گـەنج و هەرزەکار زۆری پێ دراوەو ڕێڕەوێکی بنچینەیی بۆدانراوە تاوەکو خۆشـیەکانی پـێ ببەخشێ و گرفتەکانیشی بۆ چارەسەر بکات.

## چۆنیەتی پەروەردەی تاك لەئیسلامدا:

گومان لەوەدا نییە پەروەردە ڕۆلێکـی گرنگـی هەیـە بۆپێشـکەوتنی تـاك، بنچینەو بناغەی پێشکەوتنی کۆمەڵگاشە، هەروەها هێمای گۆڕان و شۆڕشـەکانە، تاکە ڕێگای دەرون پاکی و عـەقڵی بەهێز و کارایە، ڕژێمـی سـەرکەوت و نیشـانەی پەروەردەی سەرکەوتووە، هێزی سەرکەوتوو لە جیهان خاوەنی پـەروەردەی تـەواوە، ئیسلام تاك پەروەردە دەکات لەسەر چوار بنەمای بنچینەیی کە ئەمانەن:

**یەکەم:** پەروەردەی لاشەیـــــی

**دووەم:** پەروەردەی ڕۆحـــــــــی

**سێ یەم:** پەروەردەی عــەقڵی

**چوارەم:** پەروەردەی دەرونی

**یەکەم: پەروەردەی لاشەیی:**

قسە لەسەر لاشە دەکەین مەبەست پێ ماسولکە و هەســتیارەکان و ئێسـك نییە، مەبەستمان لەو ووزە زیندووە پڕ لــە هەســت و ســۆز و پاڵنــەری (فــیتری) و هەڵچوون و داچوون و گشت هەستیارەکانی ناو لەشــیەتی. هــەموو (غــەریزەکانی) مرۆڤ بۆ سودی تایبــەتی دروســت کــراون، بــن برِکــردن و لــەناوبردنی لــە ئیســلام قەدەغەیە، پەروەردەی ئیسلامی ڕێکی خستووە بۆ ئەوەی هەرکەس بــەکاری خــۆی هەڵسێ، هەر (غەریزەیەك) تێر بکرێ بەنیازی خواپەرستی ئــەوا لەســەری پاداشــت دەدرێتەوە، پارویەك بــۆ دەمــی خێزانــت، تێرکردنــی ئــارەزوی (جنســی) لــەڕێ ی شەرعی، جێ بەجێکردنی پێداویستی خەڵك، لادانی بەردێك لەســەر ڕێــی خــەڵك، کارکردن بۆ دەستکەوتنی ڕۆزی حەلاڵ، هاوکاری کردنی برایەکت تا دەگاتە جیهــاد کردن کە ئەمانە هەموو بەلاشەی پــەروەردەکراو بــە پــەروەردەی ئیســلامی ئــەنجام دەدرێت، هەر هەموو خواپەرستین و لەڕۆژی دوایی پاداشتیان هەیە. بۆیــە عــەقڵی سەلیم و لاشەی سەلیم باشتر کار ئەنجام دەدات، چونکە مرۆڤی موسڵمان پــێ وایــە لاشەکەی موڵکی خۆی نییە بەڵکو موڵکی ئەو زاتەیە کە دروستی کردووە، خودای گەورە خۆکوشــتنی قەدەغــەکردووە دەفــەرموویت:﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ

بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴾ (النساء:٢٩) واتە: (خۆتان مەكوژن و (یەكتر بەناهەق مەكوژن، كاتێك بێزاری و بێتاقەتی ڕووتان تێ دەكات یان تووشی زیانێك دەبن)، بەڕاستی خودا میهرەبانە پێتان).

– **گرنگیدان بە پاراستنی لەش لە نەخۆشی:** پەروەردەی ئیسلامی موسڵمانانی قەدەغەكردووە نابێ گەشت بۆ شوێنێك بكەن، نەخۆشی تێدا بلاْوبووبێتەوە.

– **خۆپاراستنی گشتی:** خۆچارەسەركردن لە ئیسلامدا فەرمانە، دەبێت موسڵمان خۆی چارەسەر بكات لەكاتی نەخۆشیدا.

– **گرنگیدان بەپاك و خاوێنی لاشە:** ئیسلام چەندین دەزگای داناوە بۆ خۆ پاك كردنەوە لە هەموو پیسیەكان، بۆیە فەرمانی كردووە بەدەست نوێژ شوشتن و خۆشوشتن و سیواك كردن و پاك ڕاگرتنی جل و بەرگ، خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ ﴾ (المائدة:٦) واتە: (خودا نایەوێت لە ئاییندا تووشی سەغڵەتی و نارەحەتیتان بكات بەڵكو دەیەوێت پاك و خاوێنتان بكات (لە ڕواڵەت و ناوەڕۆكدا) و دەیەوێت نازونیعمەتی خۆی بەسەرتان تەواو بكات بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن.

– **بەهێزكردنی لاشە:** پەروەردەی ئیسلامی هانی تاك دەدات بۆ بەهێزكردنی لاشەو ڕاهێنانی لەسەر سوارچاكی و وەرزش و مەلەوانی و ...هتد.

– **گرنگیدان بە خواردنی پاك بۆ گەشەی لاشە:** پەروەردەی ئیسلامی هانمان دەدات بۆ خواردنی شتی بەسود و پاك بۆ گەشەی لاشەیەكی ڕاست و دروست و تەواو،

بەبێ زیادەڕەوی لە خواردن وخواردنەوە، وەك خودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾ (الأعراف:٣١) واتە: (ئەی نەوەی ئادەم خۆتان بڕازێننــەوە بــە پۆشـاك لەبــەرکردن لەکاتی هەموو نوێژو چوونە نـاو مزگەوتێکـدا بخـۆن و بخۆنـەوە بـەلاّم زیـادەڕەوی مەکەن چونکە بەڕاستی خودا لە سنوور دەرچووانی خۆش ناوێت).

بەم شێوازە پەروەردەی ئیسلامی لاشەی تاك پـەروەردە دەکـات بـۆ ئـەوەی لاشەیەکی کـارا و بـەتوانا و ڕاسـتی لـێ پەیـدا بێـت، ئـەمڕۆ ڕێـڕەوی پـەروەردە توانیویەتی چەندین یاریگا و شوێنی دابنێ بـۆ گەشـەی مـرۆڤ تـاوەکو لاشـەیەکی سوودبەخشی هەبێ[1]

دووەم: پەروەردەی ڕۆحی:

ئیســلام گرنگیــەکی زۆری بەلایــەنی تــاك داوە بــەتێڕوانینی پــەروەردەی ئیسلامی، ڕۆح ناوەند و خاڵی وەرچەخانە بۆ تـاك، دەسـەلاّتی گـەورە لـە دەسـتی ڕۆحە، بۆ سەر تەواوی لاشەو بەشەکانی مرۆڤ، ڕێ خۆشکەرترین کارە بۆ ڕاستەڕێی ڕووناك، دیارە توانای لاشە و عەقڵ سـنوردارە بـەلاّم ڕۆح بـێ سـنورە، سـەرەتا و کۆتایی، شوێن و کاتی دیارنییە، بۆیە بەتـەنها ڕۆحـە دەتـوانێ پەیوەنـدی لەگـەڵ زاتێك ببەستێ کە بەهەسـت هەسـتی پـێ نـاکرێ عـەقڵیش درکـی پـێ ناکـات[2] پەروەردەی ڕۆحی بۆ مرۆڤ لە هەموو بەشەکانی تر گرنگترە و پێویست ترە ئـەویش دادەمەزرێ لەسەر دوو بنەمای گرنگ.

---

[1]. سودم لەکتێبی (التربیە و دورها فی تشکیل السلوك) وەرگرتووە بۆ ئەم بەشە
[2]. التربية الاسلامية في قطب.

**١. باوەڕهێنــان بــەخوداو بــەڕۆژی دوایــی:** باوەڕهێنــان بــەخودا و بــەڕۆژی دوایــی بەهێزترین کاریگەریە لەسەر ژیانی تاك و کۆمەڵگا، باوەڕهێنان تەواوترین ڕەوشتی مرۆڤ و کۆمەڵگایە لەم ڕووەوە مرۆڤ دەتوانێ خۆشەویستی و بەزەیی و سۆز و جوانی و هاوکاری لەسەر چاکە دەربڕێ، پشتگیری لــە هــەق و خێــر بکــات. باوەڕهێنــان بەخودا ئارامی بــە دەرون دەبەخشــێ، دووری لــە بــاوەڕ ئــارامی نــامێنێ و دەرون دەکەوێتــە کێشــە و ناخۆشــی وەك خــودای گــەورە دەفــەرمووێت:﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾ (الأنعام:١٢٥) واتە: (جــا ئــەو کەســەی (خێــری تێــدابێت) و خودا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئــەوە ســینەی ســاف و پــاك و ئامــادە دەکــات بــۆ ئایینی ئیسلام، ئەو کەسەش خودا بیەوێت گومڕایی بکات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت، هەروەك ئــەوەی بــەرەو ئاســمــان بــەرز بێتەوە).

باوەڕهێنان بەخودا و ڕۆژی دوایــی هۆکــاری ســەرەکی یــە بــۆ ســەرکەوتنی موسڵمانان، هەر ئــەو باوەڕهێنانــە بــوو موســڵمانانی پێشــووی بەســەر دوژمنــان سەرخست و هەموو دونیایان ڕزگارکرد نەك بۆ ئەوەی بیکــەن بــە مــوڵکی خۆیــان بەڵکو بۆ ئەوەی شەریعەتی خودای تێدا بچەسپێنن.

**٢. پەروەردەی ڕۆحی بناغە دەکرێت لەسەر پابەندبوون بە ئادابی ئیسلامی و دەست گرتن بــە فەرمانــەکان و جــێ بــەجێکردنیان:** ئیســلام ڕێســاو ڕێبــازێکی تــەواوە و هــەموو بەشەکانی ژیان دەگرێتەوە، تاك ڕادەهێنرێت لەسەر قورئان خوێندن و فــەرموودە و ماناکانی، فێربوونی دروشمە ئایینیەکان، هەموو هــەوڵو کۆششــێك لــە ئیســلامدا مانای بەندایەتی خودا دەگەیەنێ، مادام لەسەر ڕاستەڕێی شەرع بێ و لێی لانــەدا. مانای بەندایەتی لەئیسلامدا زۆر فراوانە، پەیوەندی بەندە لەگەڵ خودا، پەیوەنــدی

بەندە لەگەڵ بونەوەر، لەگەڵ مرۆڤەکان، هەموویان لە بازنەی بەندایـەتی بـۆ خـودا دەژمێردرێت. بەرژەوەندی ڕۆحی مانای ئەوە ناگەیەنێ لە سوچێکی مزگـەوت یـان لە ماڵەوە خۆت گۆشەگیر بکەی، بەڵکو پەروەدەی ڕۆحی لە پەیوەندی بەستن لەگەڵ خودا تا دەگاتە سەرجەم بەشەکانی ژیان بەلایەنی سودەکانیەوە بۆ خـۆت و ئـەوانی تر هەموویان لەبازنەی بەندایەتی کردن بۆ خودا دەژمێردرێن.

سێ یەم: **پەرەوەردەی عەقڵ:**

عـەقڵ یەکێکە لەم بەخششە گرانبەهایانە کە خودای گـەورە بـەمرۆڤی داوە، بەم عەقڵە لە دروستکراوەکانی تـر جیادەکرێتـەوە، لـە تێـڕوانینی ئیسـلام عـەقڵ هێزێکی پەی بەرە بۆ مرۆڤ، خودای گەورە پێـی داوە بـۆ ئـەوەی بـەرپرس بـێ لـە کردەوەکانی، وە هەق و ناهەق، خێـر و شـەڕ، چـاك و خـراپ، ناشـیرین و جـوان، سودبەخش و زیانبەخش لێك جیابکاتـەوە، ئەگـەر ئەمـە نـەبوو دەبێتـە مایـەیی بەهیلاك چوونی لە دونیا و دوارۆژدا، وەك خودای گەورە دەفەرمووێ:﴿ وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ (الملك:١٠) واتە: (ئینجا دەڵێن: ئەگـەر ئێمـە گوێمان بگرتایەو بیروهۆشمان بەکاربهێنایە نەدەبووینە نیشـتەجێی دۆزەخ). کەواتـە عەقڵ هێزێکی پەی بەری (فترِیە) بەسێ مانا بەکاردێت:

١. (پەی پێ بردن)

٢. کردەوە کردن بەم پەی بردنە بریتیەلە عەقڵ و دانایی

٣. عەقڵی دڵ.

مرۆڤ هەست بە جیاوازی دەکات لەنێوان پەی بردنی عەقڵ و لۆژیك و بەڵگەداری و پەی پێبردنی دڵ، كە ڕاستەوخۆیە و ئیلهام كردنە. ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ﴾ (النجم:١١) واتە: (ئەوسا ئەوەی كە بە چاوی سەری بینی، لەناخ ودەرونیەوە بڕوای پێی هەبوو، ناخ و دەرونی ڕاستیەكانی بە درۆ نەزانی).

كاتی واهەیە مرۆڤ هەست بە ڕاستیەك دەكات لە دەركەوتنی خۆی بەڵگەیەكی (مەنتقیشی) بەدەستەوە نییە! جاری واش هەیە بەڵگەیەكی (مەنتیقی) بەدەستەوە هەیە بەڵام پێی ئارام و دڵنیاش نییە، تاوەكو دڵپاك بێت ڕاستیەكان زیاتر دەردەكەون، تاوەكو دڵ بە گوناە و تاوان تاریك بكرێ، ئەم دڵە پیسە خاڵ بەخاڵی گوناە بەتەواوی دایدەپۆشی هەموو ڕاستیەكانی لێ دەگۆڕێ، هیچ شتێك كاری تێ ناكات نە ڕاستی دەناسێ و نە كاری پێ دەكا، ئەوەی پێی ڕاستە هەر ئەوەیە كە هەواو هەوەسی فەرمانی پێ دەكات.

زانست سەرچاوەو تاكە ڕێگایە بۆ جیاكردنەوەی هەق و ناهەق، خێر و شەر. هەركاتێك كە دەشتەكییێك دەهات موسڵمان بێ، پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوەڵێكی دەسپاردو دەیفەرموو: ((خذو اخاكم فعلموه دینە)) واتە: برایەكەتان ببەن فێری ئایینی بكەن. تا وای لێهات هاوەڵان پێشبڕكێیان دەكرد لە بەدەست هێنانی زانست، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون: ((مامن خارج خرج من بیتە في طلب العلم الاوضعت الملائكة اجنحتها رضا بما یصنع))[1] واتە: هیچ كەسێك لەماڵەوە دەرناچێت بۆ پەیداكردنی زانست، ئیلا فریشتە باڵی خۆیانی بۆ ڕادەخەن، چونكە ڕازین بەوەی دەیكەن، كاتێك موسڵمان فێری زانست بوو، ئیسلام داوای لێ دەكات ئەم زانستە بكا بەكردارو بلاوی بكاتەوە لە پێناوی خودا، عەقڵ هۆكارێكە بۆ وردبوونەوە لەدەرون و نیشانەكان و ڕاستییەكانی ژیان. خودای گەورە

[1]. (رواه ابن ماجة)

دەفـــــــــــــــەرموویت: ﴿ وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ۝٢٠ وَفِيٓ أَنفُسِكُمْۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ (الـذاريات:٢٠–٢١) واتە: (بێگومان لەسەر گـۆی زەویـدا بەڵگـەو نیشـانەی زۆر هەیە (لەسەر دەسەڵات و زانیاری خـودا) بـۆ کەسـانێك کـە بـە شـوێن دڵنیاییـدا دەگەڕێن. هەروەها لـەخودی خۆشـتاندا (لەهـەموو خانەیـەکی لەشـدا، لەهـەموو ئەندامێکدا، لەهەموو کۆئەندامێکدا، لە ڕۆح و دەرون و عـەقڵدا ...هتـد بەڵگـەی بێ سنوور هەیە لەسەر زانایی و بەتوانایی و جوانکاری زاتی بەدیهێنەر) ئایا ئـەوە بۆ بینایتان ناخەنەکار).

کەواتە عـەقڵ ڕێز و پلە و پایەی هەیە و دەبێتە هۆکاری (هیدایـەت و نـور) بۆ خاوەنەکەی خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ ﴾ (الأنعام:١٢٢) واتە: (ئایـا ئـەو کەسـەی کـە مـردوو بـوو (بەهۆی بێ باوەڕییەوە)، ئینجا (بەهۆی ئیمانـەوە) زینـدوومان کـردەوە و نـوور و ڕووناکیەکمان بۆ سازکرد لە ژیانییدا (کە قورئانە) لەناو خەڵکیـدا پێـی دەڕوات و هەڵسوکەوتی پێ دەکات.

عـەقڵ لە ئیسلام کاری خۆی پـێ سـپێردراوە بـەبێ زیـادەڕەوی، نـەك وەك هەندێ دەستە، ڕۆڵێکی وەها بە عـەقڵ دەدەن کە لە سـنوری خـۆی دەبەنـە دەرەوە یان لە کاری دەخەن، بەڵام ئیسلام عـەقڵیشی وەك ئەوانی تر کاری خـۆی بـۆ دیـار دەکات[1]

[1]. تربية و دورها في تشكيل السلوك.

## قورئان و پەروەردەی عەقڵ:

قورئان چەند هەنگاوێکی داناوە بۆ پەروەردە کردنی عەقڵی مرۆڤ:

**١. پاك كردنەوەی عەقڵ لەهەموو (خورافیاتە) بێ بنەماكانی پێشوو:** وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ١٧٠﴾ (البقرة:١٧٠) واتە: (ئەگەر بەو خەڵكە نەزانە بوترێت، شوێنی ئەو بەرنامەیە بكەون كە لەلایەن خوداوە ڕەوانەكراوە، دەڵێن نەخێر، هەر شوێنی ئەوە دەكەوین كە باووباپیرانمان پێوەی ئالوودە بوون و لەسەری ڕاهاتوون، ئایا ئەگەر باووباپیرانیشیان تێ نەگەیشتو و هیچ نەزان و ناشارەزا و ڕێنموویش وەرنەگرن (هەر شوێنیان دەكەون؟!)).

**٢. دورخستنەوەی عەقڵ لەشتی گومانـاوی (الظـن):** خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا﴾ (**النجم**:٢٨) واتە: (ئەوانە لەو بارەیەوە هیچ جۆرە زانست و زانیارییەكیان نییە، بەڵكو هەر شوێنی گومانی بێ سەروبن دەكەون، لەكاتێكدا كە گومان بەهیچ شێوەیەك جێگەی هەق و ڕاستی ناگرێتەوە.

**٣. بەرپرسیاریەتی عەقڵ لەدەربڕین:** وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ (الإسراء:٣٦) واتە: ((ئەی ئینسان) لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەكەوە كە

زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی بەرپرسیارە لە بەرامبەرییەوە). ئاگاداربە عەقڵ بەرپرسە لەپەیداکردنی زانست، چۆنت پەیداکرد؟ لەچیت خەرج کرد؟

**٤. بەکارهێنانی عەقڵ بۆ بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی خودا دواتر کارکردن:** وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ ﴾ (آل عمران:١٩٠-١٩١) واتە: (بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە ئاڵوگۆری شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند. ئەوانەی یادی خودا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکارییێك، سەرنجی هەموو دیاردەیەك دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن) پەروەردگار تۆ ئەم هەموو دروستکراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکی و بێگەردی شایستەی تۆیە، دەتۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ). هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴾ (عبس:٢٤-٣٢) واتە: (دەبا ئادەمیزاد سەیری خواردنەکەی بکات و سەرنجی بدات و بیری لێ بکاتەوە. بێگومان ئێمە ئاومان بۆ داباراندووەتە خوارەوە، چۆن داباریندنێك، لەمەودوا زەویمان بۆ لەتکرد بە چەکەرەی ناسکی ڕووەك. ئینجا دانەوێڵەومان تیادا ڕوواند. هەروەها ترێ و سەوزە، هەروەها زەیتون و دارخورمایش. باخچەی دەوردراو بە دارخورما

یان درەختی تر، یاخود باخی چڕوپڕ، جۆرەها میـوە، هـاوڕێ لەگـەڵ هـەموو ئـەو گژوگیایانەی کە خواکردەو مـالاّت دەیخـوات لـە لەوەڕگاکانـدا. (هـەموو ئەمانـە ئامادەمان کردووە) تا خۆتان و مالاّتەکانتان سوودی لێوەربگرن).

ئەم ووردبوونەوە و تێڕامانە واله عەقڵی مرۆڤ دەکات باوەڕهێنانی بـەخودا بەهێز بێت، سەرەتا بەبیرکردنەوە، کۆتایی بە کارکردن، کارکردن بەدەسـتوری ژیـان کە قورئانە، جیهاد کردن لەپێناوی جێ بەجێکردنی تـا دەگاتـە بەسـتانەوەی زەوی بەئاسمان، دونیا بـەدوارۆژ و سـەرفرازی تـەواو بـۆ عـەقڵ و لاشـە و ڕۆحـی مـرۆڤ بەتەواوی[1].

**٥. تێـڕوانینی عـەقڵ بـە ڕووکەشـی (ظـاهري) زەوی و ئاسمـان وەدەسـت هێنـانی زانیـاری:** وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴾ (الـــــرحمن:٣٣) واتە: (ئەی گرۆی پەری و ئادەمیزاد ئەگـەر دەتـوانن بـە بەشـەکانی ئاسمانـەکان و زەویدا دەرچن، ئەو کارە ئەنجام بدەن، دڵنیاش بن کـە ئـەو کـارە بـەهۆی دەزگـای ماددی و مەعنەوییەوە نەبێت ئەنجام نادرێت).

لەکۆتاییـدا ئـەم قۆناغانـە عـەقڵی مـرۆڤ وا لـێ دەکـات کـە عـەقڵێکی سەرکەوتوو و خاوەنی پلانێکی ورد بێ بۆ ژیان، بـەرەنگاری ناخۆشـیەکان بێتـەوە، سوود لە خۆشیەکان ببینێ بۆ هەموو شتێك ئامادە باشی هەبێ، لەکاتی منـداڵی، لەکاتی گەنجی، لەکاتی پیری، پلانی خۆی دیاربێ، بەمە دەبێتـە کەسـێکی خـاوەن عەقڵ، عەقڵێکی پڕ سوود.

---

[1]. منهج التربية الاسلامية محمد قطب.

**چوارەم: پەروەردەی دەروونی:**

قورئان دەرونی مرۆڤ دابەش دەکات بەسێ جۆر:

**جـۆری یەکـەمیان:** دەرونـی ئارامـە، (الـنفس المطمئنـة): خـودای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴾ (الفجـر:٢٧) واتـە: (شـایانی باسـە لـە سەرمەرگدا بە ئیمانداران دەوترێت) ئەی خاوەنی دڵ و دەرونی پڕ لە ئارامی (ئـەی ئادەمیزادی ژیر و هۆشمەند کە لە تەمەنی کۆتایی دونیـادا پـەروەردگارت ناسـی و بەجوانی دەتپەرست...). ئەو دەرونەیە کە ئارامە، دوورە لە دوودڵی و دڵ تەنگی.

**جۆری دووەم:** دەرونی لۆمەکار: خـودای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾ (القیامة:٢) واتە: (سوێند دەخـۆم بـە ویـژدانی زینـدو و دەرونـی ڕەخنـە لەخۆگر کە لۆمەی خـۆی دەکـات). ئـەو دەرونـە ڕەخنـە لـەخۆی دەگـرێ، خـۆی سەرکۆنە دەکات لەکاتی خراپەکردندا.

**جۆری سێ یەم:** دەرونی فەرمانکار بەخراپە: خودای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴾ (یوسف:٥٣) واتـە: (چـونکە بەڕاسـتی دەرون (ئەگـەر بـە نووری خوداناسی ئاوەدان نەبێت) زۆر فەرماندەرە بە گوناه و هەڵـە و تـاوان، ئـەم جۆرە بەردەوام فەرمان دەردەکات کە لاشەکەی خراپە بکات. هەرکەسـێك دەرونـی بەسەریدا زاڵ بوو دەبێتە بەندەو کۆیلەی دەرونی خۆی، چۆنی بوێ ئاوای ڕادەکێشێ بەدوای خۆیدا ئەم جـۆرە: ﴿ وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖ ﴾ (البقـرة:٢٠٠) واتـە: (بێگومان ئەو جۆرە کەسە لە ڕۆژی دواییدا بێ بەهرەو بێ بەش و بێ ڕێزە).

## دەرونی مرۆڤ وزەیەکی زیندووە و هەوەس و ئارەزوی تێدایە:

هەوەس و ئارەزو بۆ خـۆی پێداویسـتیەکی سروشـتی مرۆڤـە، ئەگـەر مـرۆڤ هەوەسی خواردن و خواردنەوە بەکارنەهێنێت و قەدەغـەی بکـات دەمـرێ، ئەگـەر ئارەزوی جووت بوونی نەبێ وەچەی کۆتایی دێ  و نامێنێ، ئەگەر تورەیی و گـرژی نەیگرێ ناتوانێ بەرگری لەخۆی بکات، کەواتـە نـابێ هیچـیان بەیـەکجاری لـەناو ببردرێت، بەڵکو دەبێ پێوەرێکی بۆ دابنێ لە زیادەڕەوی و کەم تەرخەمی بیپـارێزی و هاوسەنگێکی مام ناوەندی بۆ گەلاڵە بکات.

## ڕاهێنانی دەرون:

چۆن بۆ لاشە ڕاهێنان و وەرزش گرنگە بەهەمان شێوە دەرونـیش پێویسـتی بـە ڕاهێنان و وەرزش هەیە، دەرونی مرۆڤ کۆمەڵێك پاڵنەری هەیە دەبێ ڕایـان بهێـنین لەسەر مام ناوەندبوون، دەرون بەردەوام فەرمان بە کۆمەڵێك داواکاری دەکات، وەك ژەهرێك بۆ بەکارهێنانی هێز، تورەیی، خۆبەگەورەزانین، ستەم کردن لە بـێ هێـزان، خواردنیماڵی خەڵك بەناهەق،...هتد، ڕاهێنانی دەرون لەسـەر دەربڕینـی وشـەی جوان، تورەنەبوون، ستەم نەکردن، ماڵ بەناهەق نـەخواردن، ملکەچـی و دەربـڕینی سۆز و بەزەیی و چاکەکردن تاوەکو دەرونێکـی ئـارام و خۆشـبەخت دەربچـێ، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((البر ما اطمأن اليه الـنفس واطمـأن اليـه القلـب والإثم ماحاك في النفس وتردد في الصدر وان افتاك الناس وافتوك))[1] واتـە: چـاکە

[1]. رواه احمد

ئەوەیە دڵ و دەرون پێی ئارام بێ، تاوانیش دڵ و دەروون پێی نارەحەتە). (فیترەتی) پاك و ویژدانی هۆشیار بەردەوام فەرمان بەکاری چاك دەکات، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((اذا اراد الله بعبد خيراً جعل له واعضاً من نفسه))[1] واتە: ئەگەر خودای گەورە خێر بۆ بەندەیەك بگێڕێ لەدەرونی خۆی ئامۆژگاری کارێکی بۆ دەگێڕێ.

## چۆن دەرون ڕادەهێنیت لەسەرچاکە:

١. پاك کردنەوەی دەرون لەشتی فریودەر و هەوەسبازی، بەبیرکردنەوە لەم ئایەتە:

﴿إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا﴾ (الإسراء:٣٦) واتە: (چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەرییەوە)

٢. ڕاهێنانی دەرون لەسەر خواپەرستی با بەزۆرلێکردنیش بێ تا دەرونت ڕادێ.

٣. پاك کردنەوەی دەرون بەخواپەرستی:﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ﴾ (الأعلى:١٤-١٥) واتە: (بێگومان ئەو کەسە سەرفرازە کە دەرونی خۆی پاك ڕاگرتووەو ناوی پەروەردگاری دەبات و نوێژی بۆ دەکات و کڕنووش و سوژدەی بۆ بردووە).

٤. ترسی خودا لە دڵی دابمەزرێنێ: ﴿وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ

[1]. جامع الصغير

ٱلۡهَوَىٰ ﴾ (النازعات:٤٠) واتە: (بەڵام ئەوەی لە پایەو شکۆی پەروەردگاری ترسابێت و حیسابی بۆ کردبێ و جڵەوی دەرونـی گرتبێتـەوە لـە هـەموو هـەواو هـەوەس و ئارەزویەکی نادروست...).

٥. خۆشەویست کردنی خوداپەرستی لە دەرون و ڕق لێ بوونەوە لە گوناه.

٦. خودای گەورە بکەی بە چاودێری دەرونی خۆت لـە هـەموو هەڵسـوکەوت و دەربڕینشدا: (أن تعبد الله كأنك تراه فأن لم تكن تراه فأنه يراك)[1] واتە: ئەوها خودا بپەرستە وەك ئەوەی دەیبینی ئەگەر تۆش ئەو نابینی خودا دەتبینێت.

[1]. التربية و دورها في تشكيل السلوك ص ٥٧.

# چارەسەری گرفتی هەرزەکاران لەئیسلامدا:

**(١٠) ئامۆژگاری گرنگ بۆ هەرزەکاران:**

پێش ئەوەی هەرزەکار تووشی گرفت بێ ئایینی ئیسلام کۆمەڵێك ڕێگای بۆ داناوە تاوەکو تووشی ئەم گرفتانە نەبێ، وەك (دکتۆر ئەحمەد المجذوب) دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) لەیەك فەرموودەدا گرفتەکانی هەرزەکارانی چارەسەرکردووە، نەیهێشتووە تووشی گرفت بن کە دەفەرمووێت: ((علموا اولادکم لسبع واضربوهم عليها لعشر وفرقوا بينهم في المضاجع)) واتە: منداڵەکانتان لە (٧)ساڵی فێری نوێژ بکەن لە (١٠) ساڵی ئەگەر نەیانکرد لەسەر نوێژکردن لێیان بدەن، هەر لە (١٠) ساڵی شوێنی نوستنیان جیابکەنەوە. دکتۆر دەڵێت، زانای ئەمریکی (ئەلفرێد کینزی) لێکۆڵینەوەیەکی کردووە لە ئەمریکا لەسەر (١٢،٠٠٠) لە دانیشتوانی ئەمریکی، لەسەر ئەوانەی تووشی (ممارەسەی جنسی) دەبن، لە ٢٢٪ هەرزەکارانی ئەمریکی لە تەمەنی (١٠) ساڵی تووشی (ممارەسەی جنسی) دەبن و لەکاتی پێکەوە نوستن و شوێنی نوستنیان لێك جیانەکراوەتەوە زۆربەشیان جووتبوونەکەیان یان لەگەڵ خوشکیانە یان برایان یان دایك. ئەم ڕاستییە پێش) ١٤٣٠( ساڵ لەمەوبەر پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کردینەوە و فەرمانی پێ کردووین کە ئەم هەنگاوانە جێ بەجێ بکەین دەبێتە مایەی پاراستنی هەرزەکار و منداڵەکان لە هەموو ڕەوشێکی نابەجێ.

## چەند ڕێنموونیەکی گرنگ بۆ چارەسەری گرفتی هەرزەکاران و گەنجان:

**یەکەم: سەرەتا هەرزەکاران بەشێك لە زانیاری ئاینیان فێربکرێ:** وەك:

١. لەسەر خێزان پێویستە هەندێك زانیاری ئایینی فێری هەرزەکاران بکات، نابێ تەنها پشت بە زانیاری قوتابخانە ببەستێ، بەڵکو دەبێت بۆ خۆی لەماڵەوە فێری ئاداب و ڕەوشتەکانی ئیسلامیان بکات.

٢. ڕاهێنانی هەرزەکاران لەسەر دروشمەکانی ئایینی، دایك و باوك لە سەرەتا لەسەر ئایینی منداڵەکانیان بەرپرسیارن بۆیە دەبێت هەرزەکاران ڕابهێنرێن لەسەر دروشمە دیارەکانی ئیسلام تا تەواو لەگەڵی ڕادێن.

٣. ڕاهێنان و پشتگیری هەرزەکاران بۆ خوێندنەوەی پەرتوکی ئایینی کتێب و نامیلکەی بچوك بۆ هەرزەکاران دابین بکرێت و پشتگیری و ئاسانکاری بۆ بکرێت تاوەکو لەڕێ ئەم کتێبانە بە ئیسلام ئاشنا دەبن.

٤. ڕاهێنان و هاندانیان بۆ مزگەوت و کۆڕی ئایینی، باشترین چارەسەر بۆ ڕاهێنانی هەرزەکاران، هاندانیان بۆ مزگەوت و کۆڕی ئایینی و بەردەوام بونیان لەسەر نوێژی (جەماعەت) و تێکەڵ بوونیان لەگەڵ مامۆستای مزگەوت و

موسڵمانانی ناو مزگەوت. خـودای گـەورە پلـەی ئـەو کەسـانەی لـەڕۆژی دوایـی بەرزکردۆتەوەو لەبارەیانەوە دەفەرمووێت: ((سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظـل الا ظلـه)) یـەکێك لەوانـە (شـاب نشـأ في عبـادة الله) گەنجێکـە لەسـەر خواپەرسـتی گەورەبووە.

دووەم: **هەرزەکاران فێر بکرێن لەسەر ڕەوشتی چاك و پاك:**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((ان من خيارکم احسنكم اخلاقاَ))[1] واتـە: چاکترین هەڵبژاردەکان ئەوکەسەیە خاوەن ڕەوشتی چاکە. وەهەروەها دەفـەرمووێت: ((اکمل المـؤمنين ايمانـاَ احسـنهم خلقـاَ())[2] واتـە: بـاوەڕداری تـەواو ئـەو کەسـەیە باشـترین ڕەوشـتی هەیـە. هـەروەها دەفـەرمووێت: ((اثقـل شـئ في الميـزان الخلـق الحسن))[3] واتە: قورسترین شت لە تەرازووی ڕۆژی دوایی ڕەوشتی چاکە.

سێ یەم: **گرنگی بەلایەنەکانی کەسایەتی هەرزەکار بدرێت:**

گرنگیدان بەلایەنەکانی هەرزەکار لە ڕووی لاشەو عـەقڵ و ڕۆح و ڕەوشـت و پەیوەندی کۆمەڵایەتی بدرێت بۆ ئەوەی تاکێکی ئاسودەی لێ دەربچێت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((فان لجسدك عليك حقاً())[4] واتە: بەڕاستی لاشەکەت مـافی لەسەرت هەیە.

---

[1]. رواه البخاري
[2]. رواه احمد
[3]. رواه ابو داود و الترمذي
[4]. رواه الترمذي

**چوارەم: ڕاهێنانی هەرزەکار لەسەر پاداشت و سزا:**

پاداشت و سزا هاندانە بۆ دەست گرتن بەچاکە و دوورکەوتنەوە لەخراپە، پاداشت بۆ چاکەکارەو سزاش بۆ خراپەکارو دەست درێژ و ستەمکار و خیانەتکارە، خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ۝٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾ (الشمس:٧—١٠) واتە: (سوێند بە دەرون و ئەو زاتەی کە بە ڕێك وپێکی بەدیهێناوە. جا توانای خراپە و چاکە و خوانەناسی و خواناسی تیدا دابین کردووە. (سوێند بەوانە هەموو) بەڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە کە دەرونی پاك وپوختە کردووە و باوەڕو ترسی خودای تیادا ڕواندووە. بێگومان نائومێد بوو ئەو کەسەی دەرونی خۆی ناپوخت کرد و ئالودەی گوناه و تاوان و خراپەی کرد.

**پێنجەم: تاکی هەرزەکار وا پەروەردە بکرێ تەنها لە خودا بترسێ:**

ئەگەر گەنج یان هەرزەکار وا پەروەردە کرا تەنها لەخودا بترسێ دەستی گرت بە پەروەردەی ئیسلامی و ڕۆحی ئازایەتی و چاونەترسی پەیدا دەکات، چونکە دەزانی (ئەجەل) تەنها بەدەستی خودایە، ئەوکات هەوڵدەدات بۆ سەرخستنی هەق و ڕاستی، دژایەتی زۆردار و ستەمکار دەکات، نەترسان لەستەمکاران و چاونەترسی بۆ ڕاگەیاندنی ئایینی خودا، پشت بەستن بە ئایەتی خودای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ (التوبة:٥١) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) تۆش بڵێ: هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت جگە لەوەی کە خودا بۆی نووسیوین (هەرچیش بۆمان پێش دێت هەر خێرە بۆمان)، ئەو زاتە هەمیشە یار و پشتیوانمانە، دەبا باوەڕداران هەر پشت بەو خودایە ببەستن).

**شەشەم: بەحەلاڵ تێرکردنی هەرزەکار و گەنجان:**

یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام ئەوەیە مرۆڤ تێر بکات بە حەلاڵ، پێغەمبەر (ﷺ) بانگی گەنجان دەکات و دەفەرمووێت: ((یامعشر الشباب من استطاع منکم الباء ة فلیتزوج فأنه اغض للبصر واحصن للفرج فمن لم یستطیع فعلیه بالصوم فانه له وجاء))[1] واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان ئەوەی توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بهێنێ، چاوان دادەپۆشێ و داوێنتان دەپارێزێ، کەسێك نەیتوانی با بەرۆژوبێ دەبێتە پارێزەر بۆی. ئەم فەرمانەی پێغەمبەر (ﷺ) گەنجان دەپارێزی لە فیتنەی حەرام و داوێن پیسی.

**حەوتەم: کار و خۆماندوکردن و ڕۆزی حەلاڵ لەلای هەرزەکار خۆشەویست بکرێ:**

ئیسلام گەنج و هەرزەکاران بانگ دەکات بۆ کارکردن و خواردنی نانی دەستی خۆیان، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (الجمعة:١٠) واتە: (جا کاتێك نوێژی تەواو بوو، ئەوە بڵاو ببنەوە بە زەویدا و بەتەمای بەخششی خودا هەوڵ و کۆشش بدەن، یادی خودا زۆر بکەن لە هەموو چالاکییەکانی ژیاندا با ناوی ئەو زاتە لەسەر زار و لەناو دڵتاندا بێت، بۆ ئەوەی سەرفرازی هەمیشەیی بەدەست بهێنن). وەهەروەها دەفەرمووێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴾ (الملك:١٥) واتە: (هەر ئەو زاتە زەوی بۆ زەلیل و ملکەچ کردوون (هەرچیتان بوێت لەسەری دروست دەکەن، چۆنتان بوێت بەکاری

[1]. (بخاري و مسلم)

دەهێنن)، بگەڕێن بەهەموو گۆشەو کەناریدا، لەو ڕزق و ڕۆزییەش بخۆن کە پێشکەشتان دەکات، دڵنیاش بن کە سەرئەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەو زاتەیە).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((ما اكل احد طعاماً قط خيراً من ان يأكل من عمل يده وان نبى الله داود عليه السلام كان يأكل من عمل يده())[1] واتە: هیچ کەسێك خواردنێك ناخوات چاکتربێ لەم خواردنەی بەدەستی خۆی پەیدا دەکات پێغەمبەر داود (سەلامی خودای لەسەربێ) نانی دەستی خۆی دەخوارد. هەروەها کارکردن لە ئیسلامدا خوداپەرستیە، پێغەمبەر (ﷺ) هانمان دەدات بۆ کاری بەردەوام دەفەرموێت: (لإن يحتطب احدكم حزمه على ظهره خير له من ان يسأل احداً فيعطيه اويمنعه))[2] واتە: هەر یەکێك لە ئێوە داری لەسەر پشتی خۆی باربکا چاکترە لەوەی داوا لەیەکێك بکات پێی بدات یان پێی نەدات.

**هەشتەم: ڕاهێنانی هەرزەکاران لەسەر بەپێشەنگ گرتنیان بەپێشەنگی چاك ئامادەکاریان بۆ بکرێ لەسەر ڕێڕەوی پێشەنگی چاك:**

باشترین پێشەنگ پێغەمبەرە (ﷺ) وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (الأحزاب:٢١) واتە: (سوێند بەخودا بەڕاستی لە پێغەمبەری خودا دا چاکترین نموونەی تەواو ڕێك و پێك هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خودایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خودا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بە یادی ئەو).

[1]. رواه البخاري

[2]. بخاري

هەرزەکاران خۆیان جوان بکەن بە ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) لە نەرم و نیانی و دڵسۆزی و ڕووخۆشی و داوێن پاکی و دەست پاکی و دورکەتنەوە لەتوڕەیی و هەڵچون و داوێن پیسی وخیانەتکردن.

**نۆیەم: ڕاهێنانیان لەسەر میانڕەوی و ناوەنجی لەکاردا:**

ڕاهێنانی هەرزەکاران لەسەر میانڕەوی و ناوەنجی، واتا دوورکەوتنەوە لە زیادەڕەوی و هەروەها کەم تەرخەمی وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾ (الأعراف:٣١) واتە: ئەی نەوەی ئادەم، خۆتان بڕازێننەوە بە پۆشاك لەبەرکردن، لەکاتی هەموو نوێژ و چوونە ناو مزگەوتێکدا، بخۆن و بخۆنەوە (لەنازو نیعمەتەکان) بەلاَم زیادەڕەوی مەکەن، چونکە بەڕاستی خودا لەسنوور دەچووانی خۆش ناوێت.

**دەیەم: ڕەچاوکردنی توانای هەرزەکاران:**

ڕەچاوکردنی توانای هەرزەکاران لە بوارەکانی خوداپەرستی بەشێوەیەکی پلەداری بێ و لەتوانای داهەبێ، خودای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ ﴾ (البقرة:٢٨٦) واتە: (خودای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك مەگەر بە قەدەر توانای خۆی نەبێت).

زانستی نوێ سەلماندوویەتی کە بنەمای پلەداری و ڕەچاوکردنی توانای تاك گرنگیەکی زۆری هەیە لەسەر تەندروستی دەرون و عەقڵی تاك، سەلماندراوە کە ئەرك پێ سپاردنی زیاد لە سنوری خۆی سەرنەکەوتن و هەرسهێنە، متمانە

لەدەست دەدات، منداڵ ئەركی پێ بسپێرین لە توانای نەبێ، دەبێتە هۆی گەشەنەكردنی، هەرزەكار زیاد ئەرك پێ سپاردنی دەبێتە هۆی بێ متمانەیی بەخۆی و دواكەوتنی لەكاردا.

دوای ئەم پێناسە و دیاریكردنی جۆری گەنجان و بەشێك لە پەروەردە بۆ گەنجان لەگەڵ دیاریكردنی چەند خاڵێكی بەسوود بۆ هەرزەكاران ئێستا دێین باس لە گرفتەكانی گەنجان دەكەین كە ئەمانەن:

**گرنگترین گرفتەكانی سەردەم لەلای گەنجان:**

**یەكـــەم:** درەنگ ژن هێنان، هۆكار، چارەسەر

**دووەم** : زینا كردن، هۆكار، چارەسەر

**سێیـــەم:** ئاوهێنانەوە بەدەست (إستمناء)، هۆكار، چارەسەر

**چـوارەم:** تەماشاكردنی فیلمی ڕووت، **بەتایبەت لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە**، هۆكار، چارەسەر

**پێنجەم:** نێربازی (لواطة)، هۆكار، چارەسەر

**شەشـەم:** مەی خواردنەوە (الشراب)، هۆكار، چارەسەر

**حەوتـەم:** مادده بێ هۆشكەرەكان (المخدرات)، هۆكار، چارەسەر

**هەشتەم:** جگەرەكێشان، هۆكار، چارەسەر

**نۆیـــەم:** خراپ بەكارهێنانی مۆبایل، هۆكار، چارەسەر

**دەیـــەم:** كۆچ كردنی گەنجان بۆ وولاتی كافران، هۆكار، چارەسەر



## گرفتی یەکەم:
## درەنگ ژن هێنان، هۆکار، چارەسەر

یەکێك لەگرفتەکانی سەردەم لەبەردەم گەنجان، درەنگ ژنهێنانە لەبەر چەند هۆیەك:

١. نەبوونی مادەیەکی تەواو بۆ پێك هێنانی هاوسەرگیری داواکردنی داواکاریەکی زۆر لەلایەن بوك و ماڵی باوکی بوك.

٢. نەبوونی پیشەیەکی جێگیرو ترسی بێکاری و ترسان لە بەڕێوەبردن و (نەفەقەی) خێزان.

٣. هەوڵدان بۆ گەیشتن بە خوێندنی باڵا و بەدەست هێنانی بڕوانامەی بەرز.

٤. دەست نەکەوتنی ئەو هاوسەرەی بۆ خۆی دەیەوێ.

٥. لەخۆڕازی بوون و لەخۆباییبوون بەهۆی بڕوانامە و ماڵی زۆر تا وای لێ دێت بە کەس ڕازی نی یە.

٦. بێ باکی وگرنگی نەدان بە هاوسەرگیری.

## سودەکانی زوو ژن هێنان زوو ژن هێنان کۆمەڵێك سودی تایبەتی هەیە:

١. پەیداکردنی منداڵ، کە ڕووناکی چاوی مرۆڤە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾ (الفرقان:٧٤) واتە: (ئەوانەش کە دەڵێن: پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕووناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان و بمان کە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران و خوداناسان).

کەواتە خێزان و منداڵ ڕووناکی چاوە خودای گەورە هانمان دەدات بەم ئایەتە کە زوو هاوسەرگیری ئەنجام بدەین.

٢. پەیدابوونی جوانکاری و خۆشیەکانی دونیا، منداڵ یەکێکە لە زینە و جوانکاریەکان کە مرۆڤ داوای دەکات وە پێویستی پێیەتی خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴾ (الکهف:٤٦) واتە: (ماڵ و سامان و وەچە، زینەت و جوانین بۆ ژیانی دونیا، بەڵام دڵنیابن کردەوە چاکەکان کە بەرهەمیان دەمێنێتەوە پاداشتیان چاکترە لای پەروەردگارت و ئومێد و هیوای چاکتریشی لێ دەکرێت بۆ خاوەنەکانیان).

٣. پاراستنی داوێن لە فیتنەی هەوەسبازی، زوو هاوسەرگیرکردن گەنجان دەپارێزی لە داوێن پیسی. لەبەر ئەم هۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((یامعشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج فانه اغض للبصر واحصن

للفرج ومن لم يستطع فعليه بالصوم فانه له و جاء()[1] واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان هەر کەسێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بهێنێ، چاوان دادەپۆشێ لەگوناه، داوێن دەپارێزێ، ئەگەر نەیتوانی با بەڕۆژو بێ ئەوا دەیپارێزی.

٤. کەم کردنەوەی بەدڕەوشتی لەناو کۆمەڵگا. درەنگ هاوسەرگیری کردن هۆکارێکی سەرەکیە بۆ بلاۆبونەوەی بەدڕەوشتی لەناو کۆمەڵگا و فیتنەی گەورەی لێ دەکەوێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((اذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه الا تفعلوا تكن فتنة في الارض وفساد عريض()[2] واتە: ئەگەر کەسێك هات بۆ داخوازی کچەکانتان لەئایین و ڕەوشتی ڕازی بوون لێی مارە بکەن، ئەگەر وانەکەن ئەوا فیتنە و بەدڕەوشتی لە زەوی بلاۆدەبێتەوە.

چ سوودێك لەوە گەورەترە ببێتە هۆکار بۆ پاراستنی داوێنی ئافرەتێکی موسڵمان کۆمەڵگاکەشت بپارێزی لەفیتنە و بەدڕەوشتی؟!

٥. زیادبوونی بەرەکەتی خودای گەورە لەم هاوسەرگیریە، هەر گەنجێك بەنیازی پاراستنی داوێن و چاو زوو هاوسەرگیری بکات خودای گەورە بەرەکەتی لەم هاوسەرگیریە زیاد دەکات وەك پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێت: ((من تزوج امرأة لم يرد بها الا ان يغض بصره. ويحصن فرجه او يصل رحمه بارك الله له فيها وبارك لها فيه [3] واتە: هەر کەسێك ژن بهێنێ مەبەستی لەم ژنهێنانە تەنها چاوی داپۆشێ لە حەرام و داوێنی بپارێزی و (سیلەی ڕەحم) بەجێ بگەینێ ئەوا خودای گەورە نێوان هەردووکیان پیرۆز دەکات و بەرەکەتیان دەخاتە نێوان.

---

[1]. رواه البخاري والمسلم
[2]. (رواه الترمذي)
[3]. رواه الطبراني من الاوسط

## چارەسەری گرفتەکانی درەنگ ژن هێنان:

**یەکەم:** درەنگ ژن هێنان و نەبوونی ماددەیەکی تەواو بۆ پێك هێنانی هاوسەرگیری، دەبێ موسڵمان ئەوەی لەبیر نەچێ خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (النور:٣٢) واتە: (ئەوە خودا لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەریان دەکات، خودای گەورەش هەمیشە فراوانگیرو زانایە).

ئیبن عەباس لەبارەی تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرمووێت خودای گەورە هانی گەنجان دەدات بۆ ژن هێنان و پەیمانیشی داوە کە دەوڵەمەندیان بکات.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((ثلاثة حقاً على الله عونهم، الناكح يريد العفاف والمكاتب يرد الاداء، والغازي في سبيل الله))[1] واتە: سێ کەس هەن خودا لەسەرخۆی داناوە هاوکاریان بکات، ئەو کەسەی ژن دەهێنێ بە مەبەستی داوێنی خۆی بپارێزێ، ئەو بەندەی دەیەوێ خۆی ئازاد بکات، ئەو کەسەی لەپێناوی خودا **دەجەنگێ**.

وەپێغەمبەر (ﷺ) ژنی لەو کەسە مارەکرد کە تەنها یەك ئەنگوستیلەشی نەبوو بداتە مارەیی ژنەکەی، دوایی مارەیی بەفێرکردنی قورئان لەسەر پیاوەکە دانا[2] ئەمانە هەموویان بەڵگەن کە موسڵمان دەبێ پشت بەخودا ببەستێ و خودا کاری بۆ ئاسان دەکات.

---

[1]. رواه احمد والترمذي

[2]. تفسير ابن كثير ج٣ ص٣٨٣

**دووەم:** درەنگ ژنهێنان بەهۆی نەبوونی پیشەیەکی جێگیرو بێکاری و ترسان لە (نەفەقەی) خێزان، گەنجان واگومان دەبەن کە زوو ژنهێنان گرفتێکی گەورەیە، (نەفەقەی) ماڵ و منداڵ ناتوانن بدەن، ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە، ژنهێنان خێرو بەرەکەتە بۆ خاوەنەکەی، چونکە گوێڕایەڵی کردنی خوداو پێغەمبەرە (ﷺ)، هاوسەرگیری دەبێتە خێر وبەرەکەت، ڕۆزیش بەدەستی خودای گەورەیە: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾ (هود:٦) واتە: (هیچ زیندەوەرێك نییە لەم زەویەدا ڕزق و ڕۆزییەکەی لەسەر خودا نەبێت و ئاگادارە بە شوێنی حەوانەوەو شوێنی دەرچوونیان، هەموو شتێك تۆمارە لە دۆسیەی ئاشکرادا لە (لوح المحفوظ) دا).

ڕزق و ڕۆزی ماڵ و منداڵ لەسەر خودایە نەك لەسەر تۆ:﴿نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ﴾ (الأنعام:١٥١) واتە: (چونکە ئێمە (پەکتان ناخەین) ڕزق و ڕۆزی ئێوەش و ئەوانیش دەدەین).

**سێ یەم:** هۆکاری درەنگ ژنهێنان بەهۆی خوێندنی باڵا، گەنجان واگومان دەبەن کە زوو ژنهێنان سەرقاڵیان دەکات و ناتوانن خوێندنی باڵا تەواو بکەن، ئەمە تێڕوانینێکی پێچەوانەیە چونکە هاوسەرگیری هاوکار و شوێنی ئارامی و سەکینەت و ڕوناکی چاوە، ئەمە زیاتر هاوکارە بۆ بەدەست هێنانی بڕوانامەی بەرز، ئەگەر گەنج ویژدانی ئارام بوو بیروهزری ساف بوو، دووربوو لە دڵەڕاوکێ ئەوا زیاتر خوێندنی بۆ دەکرێ، بەڵام درەنگ ژنهێنان بیروهزری دەخاتە دڵەڕاوکێوە و ناتوانێ وەك پێویست بخوێنێ.

**چوارەم:** درەنگ ژنهێنان بەهۆی دەست نەکەوتنی ئەو ئافرەتەی کە دەیەوێ بیکاتە هاوسەری ژیانی، ئیسلام بەم شەریعەتە پیرۆزەی کۆمەڵێك بنەمای داناوە بۆ هەردوو هاوسەرەکە، چۆن ژیانی هاوسەرگیری پێك بهێنن، کەسێك لێی لانەدا ئەوا سەرفراز و خۆشبەختی دونیاو دوا ڕۆژە.

**پێنجەم:** لەخۆڕازی بوون و لەخۆبایبوون بەهۆی بڕوانامە وماڵی زۆر تا وای لێ دێت بە کەس ڕازی نی یە، بڕوانامە لەم سەردەمەدا ڕەواجی یەکجار زۆرەو زۆرینەی خەڵك هەوڵی بۆ دەدەن وەك بڵێی بۆتە پێشبڕکێ لەسەرکردن لەگەڵ ئەوەی هەبوونی بڕوانامە تا بڵێی بەسودە، بەڵاّم زۆر جاریش بڕوانامە دەبێتە مایەی لەخۆبای بوون و خۆبەگەورە زانین، وادەزانێ کە کەس وەك ئەو بەتوانا نییەو کەس لەسەرووی ئەو نییە. لەم حاڵەتە شەیتان فێڵی لێ دەکات و گەنجەکە وا لێ دەکات وابزانێت کەس شایستەی ئەو نییە تا ببێتە هاوسەری ژیانی، تا وای لێ دێت زۆر بەم بیرە لاوەکییەی سەرقاڵ دەبێت و تا تەمەنی تێدەپەڕێ و دەرئەنجام بڕوانامە دەبێتە هۆی درەنگ هاوسەرگیری کردنی. بەهەمان شێوە ماڵ و سامانی زۆریش هۆکارێکی ترە بۆ درەنگ هاوسەرگیری کردن ئەمەش بەهۆی لەخۆبای بوون کەس بە شایستەی خۆی نازانێت سەرئەنجام ڕۆژێك دێت هەست دەکات کە ڕۆژگارێکی زۆر بەسەر تەمەنی کاتی هاوسەرگیری کرنی تێپەڕیووە. لەخۆبایی بوون دیاردەیەکی کوشندەیە و ئیسلام پێی ڕازی نییە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر))[1] واتە: ناچێتە بەهەشت کەسێك بەئەندازەی تۆسقاڵێك خۆبەگەورەزانی لە دڵدا بێت))، لەگەڵ چەندین فەرموودەی تر لەسەر خۆبەگەورە زانین، هەوڵدە بەم خاڵەنە چارەسەری بکە:

[1]. رواه مسلم

١. خۆبە گەورەزانین خودا لێت تورە دەبێت، بەپێچەوانەوە رەزامەندی خودایە.

٢. ملکەچی و (تەوازوع) بەرزبوونەوەیە، لەم بارەیەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((وما تواضع احد لله إلا رفعه الله))[١] واتە: هەر کەسێك بۆ خودا ملکەچ بێت ئیلا خودا بەرزی دەکاتەوە.

گەورەیی هەر سیفەتی خودایە ﴿ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ﴾[٢] واتە: هەر ئەو گەورەیەو بەرزە. مرۆڤیش لاواز و هەژارە، ﴿وَخُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ ضَعِيفًا﴾[٣] واتە مرۆڤ بەبێ هێزی لاوازی دروست کراوە.

**شەشەم:** بێ باکی وگرنگی نەدان بە هاوسەرگیری، گەنجانێك هەن زۆر بە پارەو پول کۆکۆدنەوە خەریك دەبن تا هۆگر دەبن بە پارەو سامان و دەوڵەمەندی، دەکەونەبەر پێشبڕکێ لە کۆکردنەوەی پارەی زۆر ئینجا یان لەبەر سەرقاڵی بەکاروپیشەوە یان رەزیلی و خۆشویستنی پارە ناتوانێ بڕیار بدات هاوسەر پێك بهێنێت، لەلایەکی تر زۆر گەنج هەن لەبەر متمانە بەخۆنەبوون لە پێك هێنانی خێزان ناتوانێ بڕیاری هاوسەرگیری بدات، بۆیە هەر لەسەرەتاوە گوێی پێ نادات.

بێ باکی و گوێ پێ نەدان لەهەر کارێکی گرنگ و بەسود لە ئیسلامدا ناپەسندە، بەڵکو ئیسلام چارەسەری بۆ ئەم گرفتە داناوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((أن الله يحب اذا عمل احدكم عملاً أن يتقنه))، واتە: خودای گەورە پێی خۆشە هەرکەسێك کە کردەوەیەك ئەنجام دەدات بە رێك و پێکی ئەنجامی بدات و گرنگی پێ بدات، هاوسەرگیریش گرنگترین بەشی ژیانە نابێ بێ باکی لەبەرامبەریدا بکرێت.

---

[١]. رواه مسلم

[٢]. (الرعد: ٩)

[٣]. (النساء: ٢٨)

## چۆن هاوسەری ژیانت هەڵدەبژێری:

ئەگەر گەیشتی بە قۆناغی هەڵبژاردنی هاوسەرگیری و هاوڕێ تەمەنت، پەلە نەکەی لەهەڵبژاردنی هاوسەر، بیربکەوە بەوردی و بەدانایی، عەقڵت بکە سەردار پێش دڵت.

بیر و هۆشیاریت پێش هەست و سۆز بخە، هەڵسەنگاندن بکە لەنێوان جوانی و ئایین و ڕەوشت بەرزی ئەو ئافرەتەی هەڵیدەبژێری، پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ کردووە و دەفەرموویت: ((تنكح المرأة لاربع، لمالها، ولحسبها، ولجمالها، ولدينها فاظفر بذات الدين تربت يداك))[1] واتە: ئافرەت بۆ چوارشت دەخوازرێ، لەبەر ماڵەکەی، لەبەر نەژادی، لەبەر جوانیەکەی، لەبەر ئایینەکەی، دەست بەوە بگرە کە خاوەنی ئایینە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: ((الا اخبركم بخير مايكنز المرأة الصالحة التي اذا نظر اليها سرته واذا غاب عنها حفظته، واذا امرها اطاعته))[2] واتە: هەواڵتان پێ بدەم بەچاکترین خەزێنە بۆ مرۆڤ، ئافرەتێکی (صالیحە) ئەگەر تەماشای بکەی دڵت پێی ئارام دەبێ، ئەگەر لێی دوور بێ ناموست دەپارێزێ، ئەگەر فەرمانی پێ بکەی گوێڕایەڵیت دەکات. خودای گەورە فێرمان دەکات و دەفەرموویت: ﴿ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ ﴾ (النساء:٣٤) واتە:لەولاشەوە ئافرەتی ژیر و ئایین پەروەر و گونجاو هەمیشە گوێڕایەڵی مێردەکانیانن، نهێنی نێوان خۆیان و مێردەکانیان دەپارێزن، (بەتایبەت ئەو نهێنیانەی خودا دەیەوێت پارێزراو بن) بەهۆی ئەوەی کە خودا مافەمانی ئەوانی

---

[1]. متفق عليه

[2]. ابو داود

پاراستووە. خۆشبەختی لەوە دایــە کــە خــودا و پێغەمبــەری خــودا بۆیــان دیــاری کردووین.

## پێك هێنانی ماڵ لەكاتی گواستنەوە:

دامەزراندنی كەلوپەلی ناوماڵ لەكاتی گواستنەوە، یەكێكــە لــە گرفتــەكانی بەردەم گەنجان لەكاتی ژنهێنان یان لە دوای گواستنەوە لەبەر ئەم چەند هۆیە.

١. داواكــاری بــوك یــان مــاڵی بــوك بــەبێ ڕەچــاوكردنی حــاڵی زاوا لــە ڕووی ئابوورییەوە.

٢. جاری وا هەیە زاوا بۆ خۆی زیادەڕەوی دەكات لەماڵ خەرجكردن و كەلوپــەل كڕین بە ئەندازەیەك لە توانای نییە و زۆر قەرزدار دەبێت.

٣. چــاولێكردن و لاســایی كردنــەوە لــە زۆرشــت دەبێتــە هۆكــاری گرفــت بــۆ هەردووكیان.

٤. كڕینی جۆرەها كەلوپەلی ناوماڵ كە لەم قۆناغە پێویستیان پێی نییە[١].

## چارەسەری ئەم گرفتە:

گومان لەوەدا نییە خۆشی ژیان زیاتر پەیوەندی بە دەرونی مرۆڤــەوە هەیــە، هەر كاتێك مرۆڤ دەرونی ئارام بوو ئەوا تام وچێژ لە ژیان دەكات، هاوسەران دەبــێ ڕەچاوی ئەم خالانە بكەن بۆ چارەسەركردنی گرفتی ماڵ پێك هێنان.

١. كەمكردنەوەی داواكاری بوك لەسەر زاوا چونكە خۆشی ژیــانی زاوا خۆشــی ژیانی بوكە، وە بەپێچەوانەوەش خۆشی ژیانی بوك خۆشی ژیانی زاوایە.

---

(١). الدليل التساهل للنجاح والسعادة ص ٨٨

٢. وازهێنانی زاوا لە لاسایی کردن و باوەڕهێنان بە ماڵێکی سادە بەلاّم پڕ لەئارامی.

٣. کڕینی ئەم کەلوپەلانەی کەلە سەرەتای ئەم قۆناغە پێویستن ئەوانەی تر بۆ قۆناغێکی تر هەڵگرێ.

٤. گفتوگۆکردن و لەیەك گەیشتن لەسەر خاڵی جیاواز باشترین چارەسەرە بۆ ئارامی و (سەکینەت) لەنێوان هاوسەران.

## چۆن ماڵێکی ئارام و خۆش بەخت پێك دەهێنی:

یەکێك لە هۆکارەکانی پێك هێنانی هاوسەرگیری ئارامی وخۆشی و (سەکینەتە) لە نێوانیان، هەروەك خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ (الروم:٢١) واتە: (یەکێك لە نیشانەو بەڵگەکانی تری ئەوەیە، کە هەر لەخۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی لەو دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوەو تێدەفکرن).

## بۆئەوەی ئەم ئارامی وخۆشویستنە لە ماڵەکەتدا هەبێ ئەم خاڵانە ڕەچاو بکە:

**یەکەم: خۆشەویستی دوو لایەنی:**

خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد هۆکاری ئارامی و درێژەدانی تەمەنی هاوسەرگیرییە، خاڵی بناغەییەو دەست پێکردنی ژیانێکی بێ گرفتە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لم تر للمتحابين مثل النكاح))[1] واتە: نەم بینیوە بۆ یەکتر خۆشەویستن وەکو هاوسەرگیری.

**دووەم: کامەرانی و بەختەوەری (السعادە):**

بەختەوەری دەربڕینی ئارامی یە، بەرجەستەکردنی لەماڵ خۆشبەختیە، کارپێ کردنی مایەی کامەرانی دونیاو دواڕۆژە، ژیان بێ بەختەوەری ژانە، بێ سودە. ئافرەت سەرچاوەی بەختەوەرییە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((ثلاثة من السعادة وثلاثة من الشقاء فمن السعادة المرأة الصالحة تراها فتعجبك وتغيب عنها فتأ منها على نفسها ومالك......))[2] واتە: سێ شت هەیە مایەی بەختەوەرین سێی تریش مایەی ناخۆشی و ناڕەحەتین یەك لە بەختەوەرییەکان ئافرەتی (صالحە)، تەماشای دەکەی پێی سەرسام دەبیت، دوور دەبی لێی (ئەمینی) و لەخۆی و **ماڵەکەت**... .

[1]. (رواه ابن ماجه)

[2]. رواه الحاكم في المستدرك

تۆش بەردەوام هەوڵ بدە ئەم بەختەوەریە **درێژە** پێبدەو زیادی بکە.

سێ یەم: **تێك گەیشتن و گفتوگۆکردن لەسەر خاڵە جیاوازەکان:**

تێڕوانینی مرۆڤ جیاوازە، ئاستی بیرکردنەوە لەهەر مەسەلەیەك جیاوازی دروست دەکات لەنێوان ژن و مێرد، کاتێك ژیانی هاوسەری پێك دەهێنێ کۆمەڵێك گرفت دێتە بەردەم ماڵ پێکهێنان، لەوانە مانەوە لەگەڵ ماڵی باوك، پەروەردەی منداڵ، هاتوچۆکردنی خزمان، تەواوکردنی خوێندن، نەبوونی ماددەی پێویست، بێکاری مێرد و ئەوانەو گەلێکی تر لەم گرفتانە بەشێوەیەکی سروشتی دێنە بەردەم ژیانی هاوسەران، مێزی گفتوگۆ و لێك تێگەیشتن تاکە چارەسەرە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم گرفتانە، لەیاد نەکەی ژیانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) تەماشابکە لەکاتی گرفتی خێزانی چۆن گفتوگۆی کردووەو دەروازەی چارەسەری مەسەلەکان و چارەسەریشکراوە، ئەم هەنگاوانە بەکاربهێنە لەکاتی وتوێژکردن و گفتوگۆیەکی جوان بکە وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (النحل:١٢٥) واتە: (گفتوگۆو موجادەلە بەجوانترین شێوە (لەگەڵ هەندێکی تردا بەتایبەتی خاوەن کتێبەکان).

١. بابەتەکە باش تێبگە.

٢. ووشەی جوان بەکاربهێنە.

٣. شێوازێکی نەرم و لەسەرخۆ بەکاربهێنە.

٤. کاتێکی گونجاو هەڵبژێرە.

٥. سەرەتا تەنها خۆت و هاوسەرەکەت.

٦. باسی چاکەکان بکە لەسەرەتا.

٧. بواری قسەکردن بۆ هاوسەرەکەت بهێڵەوە.

٨. مەبەستت چارەسەربێ.

٩. ووشەی (من .. من) زۆر بەکارمەهێنە.

١٠. چاوپۆشی لە هەندێك وردەکاری بکە.

١١. خۆشەویستی خۆتی بۆ دەرببڕە.

١٢. لەکاتی قسەکردن توڕە مەبە و پێکەنینت پێوە دیاربێ.

**چوارەم: گوێڕایەڵی کردن:**

ئافرەتی (صاڵحە) ئەم ئافرەتەیە کە گوێڕایەڵی مێردەکەی دەکات، لەدوای گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەری خودا (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) بەهەشتی بۆ ئەم ئافرەتە مسۆگەر کردووە، دەفەرمووێت: ((**أيما امرأة ماتت وزوجها عنها راض دخلت الجنة**))[1] واتە: هەر ئافرەتێك وەفات بکات و مێردەکەی لێی ڕازی بێ ئەوا دەچێتە بەهەشت.

هەروەها کاتێك پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد باشترین ئافرەت کێیە فەرمووی ((**التي تسره اذا نظر وتطيعه اذا امر ولاتخالفه في نفسها ولامالە**))[2] واتە: ئافرەتی چاك ئەم ئافرەتەیە ئەگەر سەیری بکەی ئارام دەگری، ئەگەر فەرمانی پێبکەی گوێڕایەڵیت دەکات، پێچەوانەی دەرونی خۆی و ماڵەکەی ناجووڵێتەوە.

---

[1]. رواه الترمذي

[2]. ابن ماجه

خوشکی بەڕێز هەوڵبدە خۆشی دونیـا و بەهەشـتی پـان و بـەرین بەدەست بهێنی بەگوێڕایەڵی کردنی مێردەکەت. گومان لەوەدانییە دەبێ مێردیش گـوێ بـۆ داواکاریـە شـەرعیەکانی ژن ڕابگـرێ و جـێ بـەجێیان بکـات پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهلي))[1] واتە:باشـترین کەسـتان ئەو کەسەیە لەگەڵ خێزانی چاك بێت، وەمنیش باشترین کەسم لـەئێوە کـە لەگـەڵ خێزانم چاکم.

**پێنجەم: لەخواترسان و خوداپەرستی:**

لەخواترسان و خوداپەرستی سەرچاوەی خۆشیەکانی ژیانە، هاوسـەران نـابێ ئەم خاڵە گرنگە لەبیر بکەن. پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بـێ) بـۆ خۆیـان بەردەوام لە خواترساون و فـەرمانیان بـە خێزانـەکانیان کـردووە کـە خوداپەرسـتی ئەنجام بدەن. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ ﴾ (طه:١٣٢) واتە: ( (ئەی پێغەمبـەر (ﷺ)، ئـەی ئیمانـدار) فـەرمان بـدە بـە هـەموو تاکـەکانی خێزانت، تا نوێژەکەیان (بەچاکی ئەنجام بدەن، چونکە خۆراکی ڕۆحە) ).

**شەشەم: خۆجوان کردن بۆ یەکتری:**

جوانی یەکێکە لەم شێوازانەی کە (فیترەتی) مـرۆڤ پێـی خۆشـە، خۆجـوان کردنی ژن و مێرد بۆ یەکتری مایەی بەختەوەریە بۆ هـەردووکیان، (ئـیبن عـەباس) دەفەرمووێت: ((إني احب ان اتزيّن للمرأة كما احب ان تتزين لي)). واتە: (من پـێم خۆشە خۆم جوان بڕازێنمەوە بۆ ئافرەتەکەم چۆن پێم خۆشە ئافرەت خۆی بـۆم جـوان بڕازێنێتەوە).

---

[1] . رواه الترمذي

**حەوتەم: خیانەت نەکردن لەیەکتری:**

خیانەت لەنێوان هاوسەران دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی یە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێت، لەکاتی ڕوودانی دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیری و جاری واهەیە کاردانەوەی خراپی لێ دەکەوێتەوە.

**ئەم ڕووداوە لەبەر چەند هۆیەك ڕوودەدات:**

١. نەبوونی پابەندبوون بە ڕێبازی خودای گەورە.

٢. دوورکەوتنەوەی یەکێك لە هاوسەرەکان.

٣. هەژاری و نەداری.

٤. بێ متمانەیی لەنێوان ژن و مێرد.

٥. نەدانی مافی تەواو لەڕووی (جنسیەوە) لەنێوان ژن و مێرد.

٦. دۆستی بێ ڕەوشت و خراپ.

٧. نەبوونی خۆشەویستی تەواو لەنێوانیاندا.

٨. خراپ هەڵسوکەوتی مێرد لەگەڵ ژن.

٩. پیری و بەساڵاچوونی مێرد کەچی ژنەکەش هێشتا گەنجە یان بە پێچەوانەوە.

١٠. خیانەت کردنی پیاو لەگەڵ ئافرەتی تر هاوسەرەکەش تۆڵەی لێ وەردەگرێ.

١١. لەسەرەتا بەیەك ڕازی نەبوون و بەزۆر لێك مارەکردن.

**هەشتەم: سوپاسی یەکترکردن و چاوپۆشی لە هەڵەی یەکتر:**

کاتێك هاوسەرەکەت کردەوەیەکی چاك ئەنجام دەدات و دڵت ڕازی دەکات و ماڵی ئارام و ڕازاوە دروست دەکات سوپاسی بکەو پیایدا هەڵبڵێ و هانی بدە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: ((من لم يشكر الناس لم يشكر الله))[1] واتە: ئەوەی سوپاسی خەڵك نەکات لەسەر چاکە سوپاسی خوداش ناکا. هەروەها چاوپۆشی کردن لە هەڵە، چونکە هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات، (كلَ بني آدم خطائون) واتە: هەموو نەوەی ئادەمێك هەڵەدەکات. واچاکە چاوپۆشی بکەین و چارەسەری هەڵە بکەین بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە سەر ژیانی ئاسودەیی کاتی پێش هەڵەکردنەکە.

## گرفتە جنسیەکان:

گەنج لەتەمەنی ١٥ ساڵی تا دەگاتە ٢٥ ساڵی لەنێو گرفتی پاڵەپەستۆی (جنسیدا) دەناڵێنێ، لەلایەك هۆڕمۆناتی لاشەی لە زیادبوونە و پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر بیروهزری، لەلایەکی تریش لە دەوروبەر دەورە دراوە بەزینە و جوانکاری ئافرەتی ڕووت، لە شاشەی تەلەفزیۆن، لە پارکەکان، لە قوتابخانە، لە شوێنی کارکردن، لە بازاڕ و کۆڵان، ئەم هەموو کاریگەریە وای لە گەنج کردووە تووشی هەڵەی (جنسی) بێت، بیرکردنەوەی لە ژنهێنان و گرفتی نەبوونی پارە و پول گرفتێکی ترە لە ئەنجامی ئەم هۆکارانە کۆمەڵێك گرفتی (جنسی) تووشی گەنجان دەبن. کە هەر یەکە لە زیناکردن و نێربازی و ئاوهێنانەوە بە دەست و تەماشاکردنی فیلمی ڕووت دەگرێتەخۆ.

---

[1]. رواه الترمذي

# گرفتی دووەم:
# زیناکردن، هۆکار، چارەسەر

ئەم گرفتە بابەتێکی گرنگ و هەستیار و ترسناکە، ئاسەواری ترسناك بەسەر تاك و خێزان و کۆمەڵگاوە بەجێ دەهێڵێ، دیاردەیەکی کۆنە، هۆکارەکانی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر جیاوازە، تایبەت نییە بەیەك ڕەگەز بەڵکو هەردوو ڕەگەز لێی بەشدارن، بەڕەزامەندی هەردووکیان دروست دەبێ، بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ئەم گرفتە سەرەتا دەبێ تیشك بخەینە سەر گرنگترین و دیارترین هۆکارەکان کە بە هۆیەوە گەنجان تووشی زیناکردن دەبن لەوانە:

**یەکەم: تەماشاکردنی ئافرەت لەلایەن پیاو و بەپێچەوانەوەش:**

تەماشاکردنی ئەو ئافرەتەی کە بۆت حەلاڵ نییە دەرگای یەکەمە بۆ توشبوون بەزینا و کردنەوەی دەرگای بەدڕەوشتی بۆ پیاو و ئافرەت، خودای گەورە فەرمانمان پێ دەکات، دەفەرمووێت:﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾ (النور:٣٠–٣١) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لەسەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکترو پوختترە بۆیان (بۆ دڵ و دەرون و ڕواڵەت و ڕۆح و لاشەیان) بەڕاستی خودا ئاگادارە بەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن. بە ئافرەتانی

ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناه و جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە (وەك دەم و چاوو دەست) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیاندا و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بە تەواوی، بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت.

ئیبنولقەیم دەفەرموویت: (والنظر اصل عامة الحوادث التى تصيب الانسان، فان النظرة تولد الخطرة ثم تولد الخطرة الفكرة، ثم تولد الفكرة شهوة، ثم تولد الشهوة ارادة، ثم تقوي فتصير عزيمة جازمة فيقع الفعل ولا بد مالم يمنع مانع) واتە: تەماشاکردن سەرەتایەکە بۆ پەیوەندی دواتر بۆ نزیك بوونەوە تادەگاتە پەیوەندی بەستن و زیناکردن، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: ((كتب على ابن آدم نصيبه من الزنا فهو مدرك ذلك لامحالة، العينان زناهما النظر)) [1] واتە: (لەسەر نەوەی ئادەم نوسراوە بەشێك لە زینا هەرتوشی دەبێ، زینای چاوەکان (تەماشاکردنە) پاراستنی چاوەکان لە حەرام، پاراستنی داوێنە، موسڵمان دەبێ لەرێگا و شوێنی کارکردن چاوی خۆی بگرێ لە حەرام تەنها بینینی یەکەم بۆی هەیەو حەلاڵە، دووەم جار لەسەری حیسابە، پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیمامی عەلی فەرموو: ((يا علي لاتتبع النظرة النظرة فان لك الأولي وليس لك الاخرة)) [2] واتە: ئەی عەلی تەماشاکردنی ئافرەتان لەدوای یەك دووبارە مەکەوە تەنیا یەکەم جارت بۆ هەیە دووەم جارت بۆ نییە. بۆ پاراستنی داوێن دەبێ لە هەموو پێشەکی یەکانی زیناکردن دوورکەوینەوە لەناو ئەوانەش تەماشاکردن.

---

[1]. رواه مسلم و ابو داود

[2]. (ترمذي).

## سوودەکانی پاراستنی چاو لەحەرام:

ئیبنولقەیم چەند سودێکی ژماردووە بۆ کەسێك چاوی لەحەرام بپارێزێ:

١. دڵ پاك دەكاتەوە لەپەشیمانی، هەر كەسێك چاوی زۆر بەكاربهێنێ لە حەرام دواتر زۆر پەشیمان دەبێتەوە.

٢. دڵی پڕ نور دەبێ و ئەم نورە لە دەم و چاوی دەردەكەوێ.

٣. بەرچاوی ڕوون دەبێ و ڕووناسی (فراسة) دەبێ.

٤. دەرگای زانست و زانیاری لێ دەبێتەوە بەهۆی پاكی دڵیەوە.

٥. دڵێكی خۆڕاگر و ئازا و بەهێزی دەبێ.

٦. دڵێكی پڕ لەخۆشی و بەختەوەری و كامەرانی دەبێ.

٧. دڵی نابێتە دیلی هەوەسبازی.

٨. دەرگایەكی جەهەننەمی لێ دادەخرێ.

٩. عەقڵ و بیركردنەوەی بەهێز دەبێ.

١٠. دڵی لە بێ ئاگابوون لەخودا دەپارێزێ.

١١. خۆشەویستی خودا لەناو دڵ زیاد دەكات.

١٢. دەبێتە خاوەنی دانایی.

## ئەم ڕێگایانەی پێغەمبەر (ﷺ) گرتوویەتیە بەر بۆ پاراستنی چاوان:

١. فەرمانی بە ئافرەتان کرد لە ناوەڕاستی ڕێگا نەڕۆن بەڵکو لەلایەکی ڕێگا بڕۆن تاکو لەگەڵ پیاوان تێکەڵ نەبن.

٢. قەدەغەی کرد کە پیاوو ئافرەت لەسەر ڕێگا دابنیشن وە فەرمانی کرد کە هەقی ڕێگا بدەن و فەرمووی: ((اعطوا الطريق حقه قالوا و ماحقه؟ قال: غض البصر وكف الاذى ورد السلام [1] واتە: مافی ڕێگا بدەن، گوتیان مافی ڕێگا چیە؟ فەرمووی چاوت بگری لە تەماشاکردنی حەرام، ئازاری خەڵك مەدەن و سەلامی خەڵکی وەلاَم بدەنەوە.

٣. خودای گەورە لە ئافرەتانی قەدەغە کرد لەکاتی ڕۆیشتن تەقەی پێ یەکانیان بێت وەك دەفەرموێت: ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ﴾ (النور:٣١) واتە:با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بە تەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت.

٤. پێغەمبەر (ﷺ) خۆبۆنخۆشکردنی ئافرەتانی قەدەغەکردووە لەکاتی چونە دەرەوە، چونکە خۆبۆنخۆشکردن هۆکارێکە بۆ سەرنج ڕاکێشانی پیاوان.

٥. پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئافرەتانی قەدەغەکردووە کە جوانی ئافرەتێکی تر بۆ پیاوەکەی باس بکات، ئەمەش هۆکارە بۆ بەدڕەوشتی.

---

[1]. متفق عليه

## زەرەرو زیانی تەماشاکردنی نامەحرەم:

دیارە چۆن جێ بەجێکردنی فەرمانێکی خودای گەورە چەند سودی هەیە بێگومان شکاندنی هەر فەرمانێکی خودای گەورە دەبێتە هۆکاری چەندین زەرەرو زیان بۆ ئەو کەسەی تاوانەکەی ئەنجامداوە، تەماشاکردنی قەدەغەکراوەکان (الحرام) سەرپێچی فەرمانێکی خودایە ئەم زەرەرو زیانانەی لێ دەکەوێتەوە.

١. دڵ تێك دەدات، چونکە تەماشاکردنی ژەهرێکە لەژەهرەکانی شەیتان.

٢. لەبیرچونەوەی زانست و زانیاری.

٣. دابەزینی بەلاَو نەهامەتی بەتایبەتی بۆ چاوان.

٤. بەتاڵ بونەوەی هەندێك لەخوداپەرستی، تەماشاکردن وا مرۆڤ سەرقاڵ دەکات بەبیرکردنەوە تا ئاگاداری هەندێك خوداپەرستی نامێنێت.

٥. بێ ئاگای لەخودای گەورە و ڕۆژی دوایی، دڵ ئەگەر بەشتی حەرام سەرقاڵ بوو ئاگای لەیادی خوداو ڕۆژی دوایی نامێنێت.

٦. ئەگەر بەتەماشاکردن زیانیان بە چاوت گەیاندو کوێریان کردی نابێ داوای خوێن بکەی.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لو اطلع احد في بيتك ولم تأذن لقذفته بحصاة ففقدته عينه ماكان عليك جناح()[1] واتە: ئەگەر یەکێك تەماشای ماڵی کردی بەبێ مۆڵەت ئەگەر بە بەرد لێی بدەی و چاوی کوێر بێ گوناهت لەسەر نییە.

---

[1]. متفق عليه

## هۆکارەکانی تەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم:

هۆکاری ئەو کەسانەی بەبێ سنور تەماشای ئافرەتی نامەحرەم دەکەن زۆرن گرنگترینیان ئەمانەن:

١. بەدواکەوتنی هەواو هەوەسی خۆی و گوێڕایەڵی شەیتان.

٢. بێ ئاگایی لە زیانەکانی تەماشاکردن کە سەردەکێشی بۆ زینا، جاریش وایە بۆ هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام وەك ئەو عاشقەی عەشقی کچێکی گاور بوو تا سەرەنجام هەڵگەرایەوە لە ئیسلام.

٣. تەماشاکردنی فیلم و زنجیرە و بەرنامە و وێنەی ئافرەتی ڕووت و ڕازاوە لە ڕێی تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان.

٤. وازهێنان لە ژنهێنان.

٥. زۆر تێکەڵ بوون و سەردانی ئەو شوێنانەی ئافرەت و پیاو تێکەڵاون.

٦. دڵخۆش بوون بەم تاوانە کە ئەنجامی دەدا، بێ ئاگای دەکات لەخودای گەورە.

٧. خۆجوانکردن و ڕووت کردنەوەی ئافرەتان لە شوێنە گشتیەکان.

٨. ووتوێژکردن لەگەڵ ئافرەتان لە ڕێگەی مۆبایل و کڕین و فرۆشتن و شتی تر.

٩. بێ ئاگایی لە سزای بەئێشی خودا کە بۆ بەندەی گوناهباری ئامادەکردووە.

١٠. خۆفریودان بەوەی کە ئەمە گوناه نییە و یان گوناهە قەیناکا لەگەڵ ئاوی دەست نوێژ دەڕوات.

## چۆن خۆت لەتەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم دەپارێزی:

١. خۆپارێزی لەخودا و ترسان لەسزاکەی.

٢. خۆرزگارکردن لەهەموو ئەم هۆکارانەی دەبنە مایەی تەماشاکردن.

٣. شارەزابوون لەزەرەرو زیانی تەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم.

٤. زانینی ئەوەی کە تەماشاکردن زینای چاوانە.

٥. لادانی گومان و دوودڵی و دڵەڕاوکێ لە ناودڵ.

٦. زۆر سوپاس کردنی نیعمەتەکانی خودای گەورە بەتایبەتی چاوەکان.

٧. بەڕۆژوبوون کە هۆکاری بەهێزە بۆ چاوگرتن.

٨. خۆتێرکردنی بە جووت بوونی حەلاڵ و ژنهێنان.

٩. دوعا و پاڕانەوە لەخودای گەورە، لەم فیتنەیە بتپارێزێ ئەم دوعایەی پێغەمبەر (ﷺ) ((اللهم اني اعوذ بك من شر سمعي ومن شر بصري ومن شر لساني ومن شر قلبي...))[1]. واتە خودایە پەنات پێ دەگرم لە شەڕی گوێیەکانم وە لەشەڕی چاوەکانم و لەشەڕی زوبانم و لەشەڕی دڵم.

١٠. ترسان لەڕۆژی دوایی و سەرەمەرگ.

١١. وازهێنان لە هاوڕێی خراپ و گەڕان لەگەڵ هاوڕێی چاك (المرء على دين خليله) واتە: مرۆڤ لەسەر ئایینی هاوڕێیەکەیەتی.

**دووەم: تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەت:**

[1]. رواه ابوداود

هۆکـاری دووەم بـۆ توشـبوونی گـەنجان بـە زینـاکردن تەوقەکردنـە لەگـەڵ ئافرەتان، چونکە حەرامە و دروست نییە، دەرگای فیتنەیە و هۆکاری دووەمـە، بـۆ گەیشتن بە زینـاکردن، پێغەمبـەر (ﷺ) لـە وەرگـرتنی (بەیعـەت) لـە ئافرەتـان تەوقەی لەگەڵ ئافرەتان نەکرد وفەرمووی: ((اني لا أصافح النساء))[1] واتـە: مـن تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم. هەروەها عائیشـە دایکـی بـاوەڕداران دەفـەرموویێت: ((ومامسّت یـده یـد امـرأة قـط)) [2] واتـە: پێغەمبـەر (ﷺ) هـەرگیز دەسـتی بەدەستی ئافرەتان نەکەوتووە.

کەواتە تەوقەکردن حەرامە بە هـەموو شـێوەیەك لـەنێوان پیـاو و ئـافرەتی نامـەحرەم، ئەمـە داب و نـەریتی کـوفرە و لەئیسـلامدا نییـە بەهـەمان شـێوە خۆپاراستنی خۆپاراستنە لەداوێن پیسی.

**سێ یەم: دەرخستنی عەورەت و خۆڕووت کردنەوە:**

دەربارەی خۆڕووتکردنەوە و لەبـەرکردنی جـل و بـەرگی سـەرنج ڕاکـێش و تەسـك و ناشـەرعی لـەخراپترین دیاردەکـانی نـاو کۆمەڵگایـە لـەم سـەردەمەدا، پێچەوانەی مرۆڤایەتی مرۆڤە، خودای گـەورە مرۆڤـی بـەجوانترین شـێوە دروسـت کردووە و بەجوانترین شێوە داپۆشیوە، هەروەك دەفـەرموویێت:﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ ﴾ (الأعراف:٢٦) واتە: (ئەی نـەوەی ئـادەم، ئێمـە بەڕاستی پۆشاکی لەبارمان بۆ فەراهەم هێناون، عەورەت و ئـەوەی پێتـان ناخۆشـە دەربکـەوێت دایدەپۆشـێت، هـەروەها جـل وبـەرگی جـوانیش کـە خۆتـانی پـێ بڕازێننەوە).

[1]. رواه احمد والترمذي
[2]. رواه مسلم والنسائی

دیاردەی خۆڕووت کردنەوە وابلاْوبۆتەوە لەماڵەکان، لەبازار و لەقوتابخانە و زانکۆکان، لـەهۆتێل و تادەگاتـە سـەرجادە و پـارك و نـاو ئۆتۆمبێـڵ، لەماڵـەوە ئافرەت لەگەڵ خزم و میوانی دادەنیشـتێت بـەجل و بـەرگێکی تـەنك و بەشـێکی لاشەی لەناو دیارە و بەشێکی ڕووتە دەڵێن کەسی غەریبمان تێدانییـە، یـان لـەناو زانکۆکان ڕووتی ئـافرەت و خۆڕازاندنـەوە، دەرکـەوتنی لەشـیان وای لـێ هـاتووە گۆشتفرۆش ئاوا گۆشتی خۆی نمایش ناکات وەك ئەوەی کە ئافرەتان لاشەیان ڕووتـە و بە دەرەوەیە. ئەمە شکاندنی فـەرمانی خودایـە، خـودای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ﴾ (النـور:٣١) واتە: (با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانـدا و جـوانی و زینـەتی خۆیـان دەرنەخەن بەتەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت).

وەهەروەها دەفەرموویێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ۚ﴾ (الأحزاب:٥٩) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: کە بە پۆشاکی بالاْپۆش خۆیان داپۆشـن ئـەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن.

دیاردەی خۆڕووت کردنەوە دیاردەیەکی نامۆیە لەئیسـلامدا، ئەمـە بەرهـەمی ئەوروپا و کوفرە.



## هۆکاری پەیدابوونی جلی مۆدە (سفور) و خۆ ڕووت کردنەوە:

خـۆڕووت کردنــەوەو جلـی مـۆدە (سـفور) وەك باسمـان کـرد دیاردەیـەکی ئیسلامی و کۆمەڵگەی ئیسلامی نییە، بەڵکو بەرهەمی دەستی کوفر و ئەوروپایـە هاتۆتە ناو کۆمەڵگای ئێمە، بەهەوڵدانێکی زۆری کوفر بۆ لـەناوبردنی کۆمــەڵگای موسڵمانان و جێ بەجێکردنی پێشبینی خۆیان. چەند هۆکارێك هــەن دەبنــە هــۆی (سفوری) ئافرەتان و خۆڕووت کردنەوەو لاشــە دەرخســتن بــەکورتی ئاماژەیــان پــێ دەکەین:

### ١. تێنەگەیشتن لە دروشمەکانی ئیسلام یان هەڵە حاڵی بوون:

ئەگەر مرۆڤ لە ئیسلام باش حاڵی بوو، ترسی خودای لە دڵی بوو، باوەڕی بــە دادپەروەری خودا هەبوو، ئەوا سەرپێچی ناکات، بــەڵکو فەرمانــەکانی خــودا جــێ بەجێ دەکات. یان واحاڵی دەبێت خۆداپۆشین (واجب) نییــە ئــەوا دەبێتــە هۆکــاری (سفوری) ولاشە دەرخستن.

### ٢. لاسایی کردنەوە (التقلید):

مەبەست لە لاسایی کردنەوەو چاولێکردنی ئافرەتی موســڵمانە لــە کــافران یان بچوك چاو لە گەورە دەکات. سەرەتا فەرەنسا توانی ئــەم دیاردەیــە لــە وڵاتــی میسر پەیدابکات، دواتر وڵاتانی تر، تائیستاش ئەم دیاردەیە بەکوێرانە چــاوی لــێ دەکرێ بەبێ ئەوەی باش لە زەرەرو زیانی (سفوری) و چاولێکردن ئاگاداربن.

### ٣. ترسان لەسەرزەنشت کردن:

زۆر جاران ئافرەت بەهۆی سەرزەنشت کردن سەرپۆشەکەی فڕێ دەدات، دەبێتە کەسێکی (سفور)، لە ترسی سەرزەنشت کردن، یان وشەی عەیبە، یان ڕەخنەگرتن لە بالاَپۆشی، فەرمانی خودا دەشکێنێ و فەرمانی شەیتان جێ بەجێ دەکات، خودای گەورە باسی باوەڕدار دەکات و دەفەرموویت: ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ﴾ (المائدة:٥٤) واتە: (لە لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسن). نابێ باوەڕدار لە سەرزەنشت بترسێ.

### ٤. بێ هێزی باوەڕ و نەبوونی بەرگری:

بێ هێزی ڕۆحی باوەڕ لەم سەردەمەدا دیاردەیەکی گشتی یە لەلای پیاوان و ئافرەتان، هۆکارەکەیشی بۆ کۆمەڵێك هۆ دەگەڕێتەوە. جێ بەجێکردنی فەرمانی خودا هێزی باوەر و ڕووبەڕووبونەوەی دەوێت، ئەم ڕۆحە لەلای ئافرەتانیش تاڕادەیەك بێ هێزە و ناتوانن بەردەوام بن لەسەر بالاَپۆشی سەرئەنجام ڕووتی و (سفوری) لێدەکەوێتەوە.

### ٥. پشتگیری کردنی (سفوری) و برەو پێدانی:

گوتمان لایەنی باوەڕی بێ هێزە لەولاوەش هۆکاری بەهێزکردنی پاڵپشتی بۆ خۆڕووت کردنەوە و (سفوری) زۆرە، دوو هێزی بنەڕەتی هەیە بەکاری دەهێنن یەکەمیان: بانگەشەی (سفوری) بەناوی ئازادی ئافرەت و پێشکەوتن لەڕێگای تەلەفزیۆن، سینەما، ڕۆژنامە، ڕێکخراو، سەنتەر، بۆنە و ئاهەنگەکان و ...هتد دووەمیان: گومان خستنە سەر بالاَپۆشی، بەناوی ستەم لەئافرەت و کۆت وبەندی ئافرەت و بالاَپۆشی دواکەوتنە ...هتد.

### شوێنەوار و پاشماوەی خراپەکانی ڕووتی و (سفوری) ئافرەت:

(سفوری) و ڕووتی ئافرەتان شـوێنەواری خـراپ لەسـەر خـودی ئـافرەت و دواتر پیاوو خێزان و کۆمەڵگا دادەنێت بەکورتی ئەمانەن:

١. ئافرەت فریو دەدات تـا لەبازنـەی ئـایین و ڕەوشـت بێتـە دەرەوە و هـەموو شتێکی پێ حەڵاڵ بێ، ئەمەیان زیانێکی گەورەی هەیە لەسەر کچانی گەنج.

٢. (سفوری) وا لـە ئـافرەت دەکـات نـەتوانێ ئەرکـەکانی ماڵـەوە بەرامبـەر بەمێردەکەی جێ بەجێ بکات، زۆربەی کاتەکانی لەدەرەوەی ماڵ بەڕێ دەکات.

٣. کاریگەری لەسەر گەنجان دروست دەکات و زۆربەی کاتەکانی گەنجان بـەفیڕۆ دەڕوات، وایان لێ دەکات هۆش و بیریان بە (غـەریزەی جنسـی) بەسـەر ببـەن تـا لەکۆتاییدا گەنجێکی دواکەوتوو لە هەموو بوارەکانی ژیانی لێ دەردەچێت.

٤. (سفوری) و ڕووتی ئافرەتان گەورەترین هۆکارە بۆ تێکچوونی تاك بەتایبەت و کۆمەڵگا بە گشتی لەڕووی ڕەوشتەوە.

٥. (سفوری) و ڕووتـی سەرچـاوەی زیناکردنـە، زینـاکردنیش دەیـان و سـەدان هۆکاری خراپی هەیە (ان شاء الله) لە شوێنی خۆی باسی دەکەین.

٦. شەرم (حیاء) بەشێکە لە باوەڕی موسڵمان، ((الحیاء شعبة مـن الایمـان))[1] واتە:شەرم بەشێکە لەباوەڕ بەهۆی (سفوری) لەئافرەت دادەڕنرێت.

٧. (سفوری) و ڕووتی دەبێتە هـۆی هاتنـە خـوارەوەی بـەڵاو تـوڕەیی خـودای گەورە.

٨. (سفوری) و خۆڕووت کردنەوە خێزان تێك دەدات سۆزو خۆشەویستی لەنێوان ژن و مێرد ناهێڵێ.

[1]. بخاري

٩. (سفوری) کاریگەری خراپ لەسەر ناوبانگی پیاو دروست دەکات.

١٠. (سفوری) و ڕووتی هۆکارە بۆ خیانەتی هاوسەرگیری.

١١. (سفوری) و ڕووتی ئافرەتان هۆکارە بۆ درەنگ ژنهێنانی گەنجەکان.

١٢. (سفوری) و ڕووتی هۆکار و هاندەرە بۆ بلاوبوونەوەی ماددە بێ هۆشکەر و خواردنی جۆرەها داوودەرمانی (جنسی) کە مایەی نەخۆشی کوشندەی بۆ هەریەك لەم خالانە وردەکاری و نمونەی ناخۆش و بەئازار هەیە.

**چوارەم: بەتەنیا بوونی ئافرەت وپیاوی نامەحرەم:**

هۆکارێکی تری تووش بوون بە زینا، بەتەنها بوونی پیاو و ئافرەتی نامەحرەمە، ئەم جۆرەش هۆکارێکی ترسناکە بۆ توشبوون بەزینا، پێغەمبەر (ﷺ) ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرمووێت: ((لایخلون رجل بامرأة فان الشیطان ثالثهما))[1] واتە: هیچ پیاو و ئافرەتێك بەتەنها پێکەوە کۆنابنەوە، ئیلا شەیتان دەبێتە سێ یەمیان. کەواتە بەتەنیا بوون لەنێوان پیاو و ئافرەت حەرامە بەبێ کەسی سێ یەم وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لایخلون احدکم بامرأة الا مع ذي محرم))[2] واتە: هیچ یەکێکتان بەتەنها لەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەم نابێ بەتەنیا کۆببێتەوە ئیلا لەگەڵ کەسێکی مەحرەم دروستە.

تەنانەت بەتەنیا بوونی لەگەڵ براژنی خۆت هەرنابێ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((ایاکم والدخول على النساء فقال رجل من الانصار یارسول الله

[1]. ترمذي و والنسائي
[2]. بخاري و ملسم

افرايت الحمو قال الحمو الموت))[١] واتــە: ئاگــاداربن بەتــەنها نەچــنە لای ئافرەتــان پیاوێك لە ئەنساریەکان گوتی، ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەگەر لەگەڵ براژنـت بیت بەتەنها، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لەگەڵ براژن بەتەنها بوون مردنە. واتـە: (مردن باشترە)، کەواتە بەتەنها بوون لەکاتی خوێندنی وانـەی تایبـەتی بەتـەنها و لەکاتی چوونە لای دکتۆر بەتەنها و خزمەتکار لەماڵەوە بەتەنها، ئەو نوسینگانەی بەتەنها پیاوێك و ئافرەتێکن، هەموویان حـەرامن، بـۆ ئـەوەی نەبێتـە (خـەلوە). بەوردی لەم فەرمووده بکۆڵەوە بۆمان دەردەکەوێ گرنگـی خۆپاراسـتن لـە بەتـەنها بوون لەگەڵ ئافرەتێك بەهۆی خزمایەتی کە ئەمڕۆ زۆربەی ڕووداوی زینـاکردن لـەم جۆرانە ڕوودەدات.

**پێنجەم: دەزگاکانی ڕاگەیاندن:**

هۆکارێکی تـر بـۆ تـووش بـوونی گـەنجان بـە زینـاکردن هەنـدێك لـەدەزگا ڕاگەیاندنەکان وەك تەلەفزیۆن، سەتەلایەت، ئینتەرنێت، گۆڤار، ڕۆژنامە، پەرتوك، زنجیرە دراما، فیلم، گۆرانی و سەماکردن ...هتد، لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێ دەزگای ڕاگەیاندن پەیوەندی بە زیناکردنی گەنجانەوە هەیە؟ وەڵامـەکـەی بـەڵێ یە! چونکە دەزگای ڕاگەیاندن دوولایەنەیـە، ئەگـەر بـۆ چـاکە بـەکاربهێنرێ ئـەوا باشترین چاکسـازی پـێ ئـەنجام دەدرێـت وەئەگـەر بـۆ خراپـە بـەکاربهێنیرێ ئـەوا کۆمەڵگا بەتەواوی بەدڕەوشـت دەکـات. دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن بەشـێکی زۆریـان گـەنجانیان بـێ هـۆش کـردووە بــە گـۆرانی لەگــەڵ ئافرەتــانی ڕووت و بەســەر

---

[١]. الحمو: بەچەند مانایەکی تریش دێت، وەك خزمی پیاو، باوکی مێرد، برای مێـرد، مـامی مێـرد، ئامۆزای مێرد، خزمی ژن، دایکی ژن، خوشکی ژن، پوری ژن. رواه مسلم

خۆشەویستیدا گوتن و جۆرێك لە فیلمی ڕووت و شێوازەکانی خۆشەویستی نێوان کوڕان و کچان، تاوای لێ هاتووە گەنجەکانمان هۆشیان لەسەرخۆ نەماوە، بەرەو هەڵدێری هەوەسبازی ڕۆیشتوون و تووشی جۆرەها بەڵای گەورەی زیناکردن و گرفتە (جنسیەکانی) تر بوونەتەوە. دەزگای ڕاگەیاندن بۆ بیناکردنی کۆمەڵگایە لەسەر بنچینەی ڕەوشت و ئادابی جوان، نەك لەخشتەبردن و هەڵوەشاندنەوەی خێزان.

زۆربەی کارە خراپەکانی ڕاگەیاندن ڕاستەوخۆ لەماڵەکان لەلایەن هەرزەکار و گەنجەکان تاقی دەکرێتەوە و (ممارسە) دەکرێت، چەندین گەنج لە ڕێی فیلمی ڕووت تووشی زیناکردن بوونە، سەرەڕای کرداری بەدی بەدەست ئاوهێنانەوە (الاستمناء)، جۆرەها کردەوەی خراپ کە مرۆڤ شەرم دەکا باسیان بکات. نمونەی خراپی زیندوو زۆرن لەناو کۆمەڵگای ئێمە، بۆ نوسینی کتێبێکی تایبەتی دەوێ، بۆیە خۆپاراستن لە دەزگای ڕاگەیاندنی خراپ بەکارهاتوو خۆپاراستنە لەزینا.

**شەشەم: تێکەڵ بوونی ئافرەت و پیاوی نامەحرەم بەبێ ڕەچاوکردنی مەرجەکانی تێکەڵ بوون:**

لەم سەردەمەدا لەزۆربەی دام و دەزگاکان پیاوان و ئافرەتان لەکارکردن تێکەڵن لە زانکۆ و پەیمانگا و ئامادەییەکان و پارك و سەیرانگاکان کە بۆتە هۆکاری تووش بوون بەزینا، دیارە ئێمە ناڵێین با ئافرەت نەخوێنێ و کارنەکا، بەڵکو بەپێچەوانەوە پێویستە لەم سەردەمەدا ئافرەت لەمەیدانی کار و خوێندندا بێت، بەڵام نەك بەتێکەڵی چونکە ئەم دوو ڕەگەزە لەکاتی کارکردن جۆرێك لە وتوێژ و ڕێکەوتن دروست دەبێت سەرئەنجام دڵیان بۆیەك دەچێت و زینای لێ دەکەوێتەوە.

## زەرەرو زیانەكانی تێكەڵی:

دیارە لە جیهانی ئەو سەردەمەماندا لەو شوێنانەی تێكەڵی نێرو مێ شتێكی ئاساییە و زۆرباوە، ئافرەتان و كچان دەناڵێنن بەدەستی ئەم دەست درێژیانەی ڕۆژانە دەكرێتە سەریان، بەتایبەتی لە نەخۆشخانە و زانكۆ و خوێندنگاكان ئەو تێكەڵیە بۆتە هۆكارێكی زۆر مەزن بۆ تووش بوونی گەنجان بە زیناكردن.

ئەمەی خوارەوە هەندێك لەو دەرئەنجامە خراپانەیە لەئەنجامی تێكەڵی كوڕان و كچان:

١. گۆڤاری (فروندین)ی ئەڵمانی تایبەتە بەكاروباری ئافرەت بەدیاری خستووە لە (٦٨٪) لە ئافرەتە فەرمانبەرەكان تووشی دەستدرێژی سێكسی بەردەوام دەبنەوە لەلایەن ئەو كوڕ و پیاوانەی كاریان لەگەڵ دەكەن لە شوێنی ئیش و كاریان.

٢. د. ڕۆبێرت هێرشكۆویز دەڵێ، ئەو قوتابیانەی زینا دەكەن پێش شوكردنیان ڕێژەیان بۆتە (٨٠٪) لە دەرەئەنجامی تێكەڵی.

٣. د. (ونستائن) دەڵێ، ڕێژەی زیناكاران لە قوتابخانە تێكەڵییەكان بەرزترە بەبەراورد لەڕێژەی زیناكاران لە قوتابخانە ناتێكەڵەكان.

٤. قوتابیەكی زانكۆی میشیگان دەڵێ كچە داوێن پارێزەكانی ئەم زانكۆیە، كە زانكۆیەكی تێكەلاوە ڕێژەیان ناگاتە لەسەدا بیست (٢٠٪).

٥. لەزانكۆی (سراكوز) لە (٦٠٠٠) هەزار كچی قوتابی (٤٠٠) یان لە زینا دووگیانن.

٦. لەسەرژمێرێك لەیەكێك لە قوتابخانەكاندا دەركەوتووە لە(٢٠٪)ی كچەكان

هاوسەرگیری بەئاشکرایان دەوێ، وە لە(٢٠٪) زینا دەکەن و منداڵی زینایان هەیە لە (٦٠٪)ی زینا دەکەن و بە بەکارهێنانی حەبی قەدەغەکردنی منداڵ نایەڵن منداڵیان ببێ.

د. مارگرێت مید دەڵێ، پێشتر کۆلێژ و زانکۆکان قەلای کچانی داوێنپارێز بوون ئێستا بوونەتە ناوەندی بەدڕەوشتی و خراپە و تاقی کردنەوەی پیاوان[1].

### تاوانی زیناکردن لەڕووی شەرعیەوە:

زینا یەکێکە لە تاوانە گەورەکان تۆڵەی ئەم تاوانە خودای گەورە لە قورئاندا بە ئازارێکی بەئێش و زیادبوونی سزای بەردەوام باس کردووە و دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٍۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ (الفرقان:٦٨—٧٠) واتە: (هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خودایەکی تر لەگەڵ خودا دا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خودا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بە حەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە تووشی سزا و ئازار و ریسوایی دەبێت. لە قیامەتیشدا ئازارو سزای بۆ چەند بەرامبەر دەکرێت و بە زەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزارییەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتەسەر. مەگەر ئەو کەسەی تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت و کاروکردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئا ئەو جۆرە کەسانە خودا کاروکردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، چونکە هەمیشە و بەردەوام خودا لێخۆشبو

[1]. ئەم بەشە لەگۆڤاری چرای رووناکی ژمارە (٣) وەرگیراوە.

و میهرەبانە (بەرامبەر خەڵکی بەگشتی و ئەو جۆرە کەسانە بەتایبەتی)).

خودای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە لە ترسناکی ئەم کارە و دەفەرموویێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ (الإسراء:٣٢) واتە:(هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناه و تاوان و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە).

پێغەمبەر (ﷺ) بەهەمان شێوەی ترسناکی ئەم کارەی ڕاگەیاندووە، دەفەرموویێت: ((لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتي يعلنوا بها الا فشا فيهم الطاعون والاوجاع التى لم تكن مضت في اسلافهم))[1] واتە: هیچ گەلێك کاری بەدڕەوشتیان لەناو بلاّونابێتەوە تا ئاشکرای نەکەن، ئەگەر ئاشکرایان کرد ئەوە نەخۆشیی تاعون وجۆرەها نەخۆشیان لەناو زیاد دەبێ کە پێشتر لە باب و باپیریان نەبووە. هەروەها زیناکردن دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی باوەڕ لە دڵی باوەڕدار لەکاتی ئەنجامدانی ئەم کارە وەك پێغەمبەر (ﷺ) پێمان دەفەرموویێت: ((واذا زنى العبد خرج منه الايمان فكان على رأسه كالظلة فإن اقلع رجع اليه))[2] واتە: ئەگەر بەندەیەك زینای کرد لەکاتی زیناکردن ئیمان لەلاشەو دڵی دەردەچێت و لەسەر سەری ڕادەوەستێت وەکو چەتر هەر کاتێك تەواو بوو دەگەڕێتەوە. کەواتە زیناکردن لە تاوانە گەورەکانە وخۆپاراستنی زۆر پێویستە.

### تاوانی زینا هەندێکیان لەهەندێکیان گەورەترن:

زیناکردن لەڕووی تاوانەوە هەندێکیان لەهەندێکیان گەورەترن وەك:

١. زیناکردن لەنێوان ئافرەتی خاوەن مێرد لەگەڵ پیاوی خاوەن ژن گەورەترە لە زیناکردنی لەنێوان کوڕێك ژنی نەهێنابێ و کچێك شووی نەکردبێ.

[1]. اخرجه حاكم وابن ماجه

[2]. رواه ابوداود ولحاكم

٢. زیناکردن لەگەڵ مەحرەمی خۆی وەك دایك، خوشك، پور گەورەتر و ترسناکترین تاوانە بەبەراورد لەگەڵ ئەوانی تر.

٣. زیناکردن لەگەڵ دراوسێ تاوانەکەی گەورەترە لەگەڵ کەسێك کە دراوسێ نەبێ.

٤. زیناکردنی ئاشکرا تاوانی گەورەترە لە زیناکردنی بەنهێنی.

٥. زیناکردنی پیاوێك یان ئافرەتێکی بەتەمەن تاوانەکەی گەورەترە لەگەنجێك.

٦. زیناکردنی زانایەك (عالم) تاوانی گەورەترە لە زیناکردنی نەزانێك (جاهل).

٧. زیناکردنی دەوڵەمەندێك توانای ژنهێنانی هەبێ تاوانەکەی گەورەترە لەهەژارێك، نەتوانێ ژن بهێنێ.

٨. زیناکردن لەمانگی ڕەمەزان تاوانەکەی گەورەترە لەمانگەکانی تر.

٩. زیناکردن لەناو کۆمەڵگایەکی موسڵمان تاوانەکەی گەورەترە لە ناوکۆمەڵگایەکی ناموسڵمان.

١٠. زیناکردن لەگەڵ ئافرەتێکی موسڵمان تاوانەکەی گەورەترە لەگەڵ زیناکردن لەگەڵ ئافرەتێکی ناموسڵمان.

تێبینی، ئەمانە هەموویان هەر زینان و (حەدی) شەرعیان لەسەرە، بەلاّم تاوانەکانیان هەندێکیان لەهەندێکیان گوناهبارترن لەلای خودای گەورە لەبەر ئەوەی سەردەکێشێت بۆ هەندێك بەدڕەوشتی تر لەناو کۆمەڵگای موسڵمان. ئەم جۆرانە هەموویان بەڵگەیان هەیە بەلاّم لەبەر درێژی بابەتەکە نەمانتوانی باسی بکەین.

**زەرەرو زیانی زیناکردن لەسەر کەسی زیناکارو خێزان و کۆمەڵگا:**

زیناکردن زەرەرو زیانی زۆرە بۆ تاك، بۆ کۆمەڵگا، بۆ خێزان، بۆ ژینگە ...هتد. ئەو زەرەرو زیانانەی تووشی کەسی زیناکار دەبن بەکورتی ئەمانەن:

١. بێ ئایینی و لەدەستدانی پیاوەتی و بێ غیرەتی.

٢. بێ شەرمی و بێ ئابروویی کە هەبوونی بەشێکە لە باوەڕ.

٣. ڕەش بوونی دەم وچاوو ناشیرین بوون لەبەر چاوی خەڵك.

٤. دڵ تاریك دەکات و ڕووناکی تێدا ناهێڵێت

٥. تووش بوونی هەژارییێکی بەردەوام.

٦. دارنینی کردەوە چاکەکان وەك چاکە، خێر، داوێن پاکی، دادوەری، لەشوێنی ئەم کردەوە چاکانە ناوی خراپەکار، داوێن پیس، زیناکار، خائینی بۆ بەکاردێت.

٧. خەڵکان بەچاوی سوکەوە تەماشای دەکەن و کەس لێی دڵنیا نییە، بۆیە دووری دەخەنەوە لەخۆیان و خێزانیان لەبەر خیانەتەکەی.

٨. زیناکار بۆنێکی ناخۆشی لێدێت، هەموو موسڵمانێکی ڕاستەقینە و لە خواترس بۆنی دەکات و هەستی پێ دەکات.

٩. زیناکار بەردەوام دڵی تەنگە و هەست بە نائارامی دەکات.

١٠. (سیلەی ڕەحم) بەجێ ناگەینێ و هەقی دایك و باوکی ناداو ماڵی حەرام پەیدا دەکات و چاوی لێیە ستەم لە خەڵك بکات.

١١. ئەگەر خێزان و منداڵی هەبێ لێك هەڵدەوەشێ و لە دەستیان دەدات.

١٢. هەرکەس زینا بکات و لەسەری بەردەوام بێ و تۆبە نەکات لە حۆری بەهەشت بێ بەش دەبێت.

١٣. زیناکردن زیاتر کاریگەری لەسەر ئافرەتان هەیە و سەریان شۆڕ دەکات لەناو خزم و کەس و کۆمەڵگا.

١٤. زەرەرو زیانی زینا دوای تۆبەکردن لە کوفرکردن زیاترە، چونکە کەسێك کە تۆبە دەکات لە کوفرکردن پاك دەبێتەوە و ئاسەواری بەسەر نامێنێ، زیناکاریش پاش تۆبەکردن پاك دەبێتەوە، بەلاَم ئاسەواری دوای تۆبەکردنیش هەردەمێنێ و لە دەرونەوە ئێشی پێ دەگات.

١٥. ئەگەر بەم زینایە ئافرەت تووشی سك پڕبوون بوو، دوایی منداڵەکەش کوژرا ئەوا زینا و تاوانی کوشتن پێکەوە کۆدەبنەوە لەسەر زیناکارەکە، وە ئەگەر ژنەکە منداڵی بوو لەنێوان جووت بوون لەگەڵ مێردەکەی خۆی و زیناکردن منداڵی لێ پەیدابوو، منداڵەکە لە زینابوو، درایە پاڵ مێردەکە، ئەو منداڵە میرات دەگرێ لە خێزانە شەرعییەکەو کە هەقیش نییە.

١٦. ئەگەر منداڵی زینا مایەوەو گەورەبوو لەناو کۆمەڵگا بەچاوی سووك تەماشا دەکرێ، وەئەگەر ئاشکراش بوو لەلای خۆی ئەوا تاماوە هەر لە ناخۆشی دەژیت جگەلە بێ بەش بوونی لە هەست و سۆزی دایك و باوکایەتی، ئەم منداڵە چ تاوانێکی هەیە؟!

١٧. زیناکردن سەرچاوەی شەڕو ئاژاوەو کوشتنی نێوان هۆز و ناو کۆمەڵگایە چەندین کەس بەهۆی زیناکردنەوە کوژراون، ئافرەت و پیاو کوژراوە، دوو هۆز چەندین کەسیان لە  یەکتر کوشتووە.

١٨. زیناکردن کاریگەری لەسەر خزم و کەس و ژن وپیاو بەجێ دەهێڵێ، ئەگەر ئاشکرابوو بەردەوام هەست بەچاو شۆڕی و سەرشۆڕی دەکەن.

١٩. زینا هۆکارێکی گەورەیە بۆ پەیدابوونی جۆرەها نەخۆشی بەتایبەتی ئایدز کە لەدوایی ئەم بەشە بەدرێژی باسی دەکەین.

٢٠. زیناکردن هۆکارە بۆ لەناوبردنی نەك هەر تاك و خێزان و کۆمەڵگا بەڵکو دەبێتە هۆی لەناوبردنی ئومەتێك و خودای گەورە سزای خۆی دەنێرێ. عەبدوڵلا کوڕی مەسعود دەفەرموویێت: ((ماظهر الربا والزنا في قرية الا اذن الله بإهلاكها)). واتە: ڕیبا و زینا لەناو هەر شارێك بڵاو ببێتەوە ئیلا خودای گەورە بڕیار بە لەناوچونیان دەدات. ئەمانە چەند ئاسەوار و زەرەرو زیانێکی زیناکردن بوون لەسەر تاك وخێزان و کۆمەڵگا زۆر بەکورتی، بۆ هەموو خاڵەکان بەڵگە هەیە بەلاّم لەبەر درێژبوونەوەی بابەتەکە بەکورتی باسمان کرد، جگە لەمەش زیناکردن ئاسەوار و زەرەری کۆمەلاّیەتی هەیە وەك بلاّوبونەوەی زینا و نەخۆشی و دوورکەوتنەوە لە ژنهێنانی شەرعی و لەناوچوونی بەهای ڕەوشتی و تێکچوونی خێزان و بنەما کۆمەلاّیەتیەکانی خێزان و زیادبوونی گۆرانی و سینەما و ڕووتی و دەست درێژی کردن و نەمانی ئاسایش و هێمنی ولاّت و بلاّوبونەوەی تاوان و کوشتن و زیادبوونی منداڵی زینا ...هتد.

هەروەها زیناکردن ئاسەواری دەرونی هەیە وەك خۆکوشتن و خۆلەناوبردن و لەدەستدانی هەست وسۆز باوکایەتی و دایکایەتی منداڵ و خێزان.

**نەخۆشی یەکەم: ئایدز، شەڕێکی دژ بەمرۆڤایەتی کەلە زینا پەیدا دەبێت:**

**ئایدز چیە؟**

ئایدز نەخۆشیەکی کوشندەیە بەکورتی پێناسە دەکرێت بەوەی کە ئایدز دەبێتە هۆی نەمانی بەرگری لەش بەرامبەر نەخۆشیەکان، واتە لەش توانای بەرگری نامێنیٚ کاتی هاتنی هەر ڤایرۆسێك بۆ ناو لەش.

## گواستنەوەی ئایدز:

دەکرێ نەخۆشی ئایدز بکرێ بەدووبەشەوە:

١. ئەوانەی تەنها هەڵگری ڤایرۆسی (HIV) ئایدزن.

٢. ئەوانەی تووشی نەخۆشی ئایدز بووینـە، ڤایرۆسـی (HIV) لـەناو خـوێن و شیری مەمکی ئافرەت و (جهازی تەناسلی) و ئاوەزلـەی بـرین و لیـك و شـلەکانی لەش دەژی.

## ڕێگاکانی گواستنەوەی ڤایرۆسی ئایدز:

١. لەڕێگەی جووت بوونی ناشەرعی پەیدادەبێت.

٢. لەکاتی (مومارەسەی جنسی) لەگەڵ کەسی تووشـبوو بـە ڤایرۆسـی ئایـدز دەگوازرێتەوە.

٣. بەکارهێنانی سرنج و دەرزی بۆ چەند کەسێك.

٤. خوێندان بە کەسێکی تر بەبێ پشکنین.

٥. شلەی کەسێکی تووش بوو بگوازرێتەوە بەهەر ڕێگایەك بۆ یەکێکی تر.

٦. گواستنەوەی لەڕێگەی ماددەی سڕکەر.

٧. تووش بوونی منداڵی لەڕێگەی دایکی کە تووشی ڤایرۆسی ئایدزبووە.

٨. لەڕێگای نەشتەرگەری.

**قۆناغەکانی ئەم نەخۆشیە:**

**ئەم نەخۆشیە بەچەند قۆناغێك تێ دەپەڕێت:**

**قۆناغی یەکەم:**

ئەم نەخۆشیە دوای سێ یان چوار هەفتەی پاش تووش بوونی لاشە بەڤایرۆسی ئایدز ئەم نیشانانەی لەسەر دەردەکەوێت:

١. تایەکی گەرم

٢. هەوکردنی قوڕگ

٣. ئێشی ماسولکەکان

٤. گەورەبوونی گرێیەکانی مل.

ئەم نیشانانە بۆماوەی هەفتەیەك یان دووهەفتە دەردەکەون دواتر بزر دەبن. ئەم قۆناغە بەهەڵگری ڤایرۆسی (HIV) ناودەبرێت دواتر دەبێتە نەخۆشی ئایدز.

**قۆناغی دووەم:**

ئەم قۆناغە بەقۆناغی ڕەشکە دەناسرێتەوە کەلە شەش مانگ تاچەند ساڵێك درێژە دەخایەنێت و لەش بەرگری کەم دەبێت و بەشێوەیەکی پلەپلەیی کەسەکە بەرەو نەخۆشی ئایدز دەچێت و نیشانەی ڤایرۆسەکە (HIV) لەسەر دەرناکەوێت ئەم قۆناغەش لەگەڵ قۆناغی یەکەم بە قۆناغی ئامادەسازی بۆ تووش بوون بە نەخۆشیەکە ناودەبرێت.

**قۆناغی سێیەم:**

ئەم قۆناغە ناودەبرێت بە نەخۆشی ئایدز لەساڵێك تا دووساڵ دەخایەنێت

دواتر کەسی تووشبوو دەمرێت. ئەم قۆناغەش بەئاشکرا ئەم نیشانانەی لێ دەردەکەوێت.

١. تایەکی گەرم

٢. کێشی کەم دەبێت شەوانە ئارەقە دەکات.

٣. ئاوسانی لیمفە گرێیەکان

٤. دەرکەوتنی نەخۆشی شێرپەنجە بەتایبەتی شێرپەنجەی پێست و هەوکردنی مێشك

٥. کەچەڵ بوونی لوت و قورگ.

**خۆپاراستن لەنەخۆشی ئایدز:**

ئایدز گەورەترین هەڕەشەیە لەسەدەی (٢١) لە دژی مرۆڤایەتی، ئەمڕۆ ئایدز بەلاّیەکی کوشندەو سامناکە لەئاستی جیهانی دایە، ئاماری زەرەرو زیانی ئەم نەخۆشیە لەپاش دوو شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی لە هەموو شەڕەکانی دیکە زیاترە، ئایدز چەکێکی بێ دەنگە مرۆڤەکان بەدەستی خۆیان خۆیان پێ دەکوژن، بۆیە دەبێ کۆمەڵگا هۆشیاربێ بۆ ڕێگرتن لەم نەخۆشیەو خۆپاراستنی لێی، خۆپاراستنی بەم شێوەیە دەبێت.

١. بن بڕکردنی هەموو جۆرە کردەوەیەکی سێکسی ناشەرعی جا نێر لەگەڵ مێ، یان نێر لەگەڵ نێر.

٢. نەهێشتنی هەموو مادده سڕکەر و بێ هۆشکەرەکان.

٣. زوو چارەسەرکردن و جیاکردنەوەی ئەو کەسەی هەڵگری ڤایرۆسی (HIV)ن.

٤. لەکاتی وەرگرتنی خوێن بەباشترین شێوە پشکنینی بۆ بکرێ.

٥. بەکارنەهێنانی کەل وپەلی پزیشکی بەکارهاتوو بەهەموو شێوەکان.

٦. دوورخستنەوە و پشکنینی کەسی تووشبوو بۆ شوێنی تایبەت و تاقیگە و نەخۆشخانەی تایبەت.

٧. پشکنینی ئەو کەسانەی لەدەرەوەی وولاّت دێن و ڕێنەدان بەهاتنی ئەو کەسانەی هەڵگری ڤایرۆسی ئایدزن.

٨. هۆشیاری بلاّوکردنەوە لەبارەی ئەم نەخۆشیە لەڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و دام و دەزگاکان بەگشتی.

٩. خەتەنەکردنی پیاوان، لێکۆڵەرەوەیەکی پەیمانگای پزیشکی ئەمریکی دەریخستووە کە خەتەنەکردن لە (٥٠٪) مرۆڤ دەپارێزی لەنەخۆشی ئایدز...

**ژمارەی ئەو کەسانەی توشی نەخۆشی ئایدز بوون لەجیهان:**

بلاّوبوونەوەی ئەم نەخۆشیە و زیادبوونی بەشێوەیەکی زۆر زوو گەشەدەکات و لەگەڵ پەیدا بوونی چەندین ڕێکخراوی جیهانی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم نەخۆشیە، کەچی ساڵ بەساڵ ڕوو لەزیادبووندایە و زۆر بەخێرایی تەشەنە دەکات.

بەپێی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لەساڵی (٢٠٠٤) ئەوانەی تووشی نەخۆشی ئایدز بوون لەجیهان ژمارەیان تا ئەو کاتە گەیشتۆتە (٤٢) ملیۆن کەس، ڕێژەی تووش بووانی ئەم نەخۆشیە لە (٣٦٪) یان ئافرەتن و زۆربەیان لەتەمەنی هەرزەکاری و گەنجیدان. ئەم ڕێژەیە لەگۆڤاری ( peditvic clinics of

north amrica) بڵاوکراوەتەوە دەڵێت: (تاوەکو ڕێژەی (مومارەسەی) سێکسی لەڕێی ناشەرعیەوە زیادبێ، ئەم نەخۆشیەش زیاد دەبێت)، بەگوێرەی دوائامـاری ڕێکخراوی جیهانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشی ئایدز لەساڵی (١٩٨٠) تاکو ئێستا (٢٥) ملیۆن کەس گیانیان لەدەستداوە بەهۆی نەخۆشی ئایدز، هەروەها ئەم ڕێکخراوە هۆشداری دا بەتایبەتی بۆ ئافرەتان کە هەوڵی ڕێگرتن بدەن لەم نەخۆشیە و دوائامار ئاماژەی بەوەدا کەڕێژەی تووشبووان لەمنداڵ و هەرزەکار لەم ساڵەدا گەیشتۆتە (٣٣) ملیۆن کەس.

دیارە بەگوێرەی یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی ناوەندی ئەمریکی بۆ خۆپاراستن لە ئایدز و زاڵبوون بەسەر ئەم نەخۆشیەدا دەڵێن (٩٠٠) هەزار ئەمریکی تووشی ڤایرۆسی ئایدز بوون و نیوەی ئەوانەش ئاگادارنین و نازانن کە هەڵگری ڤایرۆسی ئایدزن ((هەروەها ئەم ناوەندە دەڵێت، ساڵانە لە ئەمریکا (٤٠) هەزار کەس تووشی ئەم ڤایرۆسە دەبن. وەیەکێك لە ڕاپۆرتەکانی ئاماژە بەوە دەکات کە واشنتۆنی پایتەختی ئەمریکا لەساڵی (٢٠٠٨) زۆرترین ژمارەی تووشبووانی بەم نەخۆشیە تێدا تۆمارکراوە. بەڵام کیشوەری ئەفریقیا زۆرترین بەشی بەردەکەوێت.

### ئایدز لەولاَتانی عەرەبی:

نەخۆشی ئایدز تەنها لە ئەوروپا و ئەفریقیا نییە بەڵکو لەناو ولاَتانی عەرەبیش بڵاوبۆتەوە.

ئەندازەکراوە ژمارەی تووشبووانی بە ڤایرۆسی ئایدز لەڕۆژهەلاَتی ناوەڕاست و باکوری ئەفریقیا دەگاتە (٥٠٠) هەزار تا (٧٥٠) هەزار کەس، ژمارەی تووشبووانی منداڵی لیبی گەیشتۆتە (٤٠٠) کەس، ڕاپۆرتەکان وائاماژە دەکەن کە لە ولاَتی مەغریب بەشێوەیەکی زۆر بڵاو ئەم ڤایرۆسە زیادی کردووە.

لە وڵاتی سعودیە ئەوەی بەفەرمی تۆمارکراوە ڕێژەی تووشبووان گەیشتۆتە (٧) هەزار کەس لە (٤٥٪) بەهۆی پەیوەندی سێکسی ناشەرعی و لە (٢٠٪) بەهۆی گواستنەوەی خوێن و لە (٢٪) بەهۆی ماددەی سڕکەر و لە (٢٧٪) یشی دیاری نەکراوە، شاری (جدە) زۆرترین ژمارەی بەرکەوتووە لەم نەخۆشیە.

لە وڵاتی ئوردەن ڕێژەی تووشبووان گەیشتۆتە (١٠٠٠) کەس، ڕاپۆرتەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە بڵاوبونەوەی نەخۆشی ئایدز زۆربڵاوە لە وڵاتانی ئەفریقیا و وڵاتە گەشە سەندوەکان (الدول النامیە)، وە بڕی ئەو پارەیەیی کە بۆی داواکراوە تاوەکو ڕووبەڕووی ئەم نەخۆشیە ببنەوە دەگاتە (٢٢) ملیار دۆلار.

ئاگاداربە پابەندبوون و دەست گرتن بە شەریعەتی ئیسلام بەبێ ئەم هەموو ملیار دۆلارە چارەسەری تەواوی ئەم نەخۆشیە دەکات[1].

نەخۆشی دووەم: **لێ تکان یان لەبەر ڕۆیشتن (السیلان):**

لێ تکان، نەخۆشی دووەم کەلە ئەنجامی زیناکردنی ناشەرعی پەیدادەبێت، ڕاپۆرتی پزیشکی دەریخستووە کە زینای ناشەرعی دەبێتە هۆی چەندین نەخۆشی ترسناك یەکێك لەوانە لێ تکانە (السیلان) ئاو دابەزینە لە ئەندامی زاوزێی نێر یان مێ، بەگوێرەی گۆڤاری ئەمریکی (peditvic clinics of north amrica) بڵاوی کردۆتەوە ئەوانەی تووشی نەخۆشی سەیلان دەبن ڕێژەیان دەگاتە (٦٢)ملیۆن کەس لەجیهان، نیوەیان لەڕۆژهەڵاتی ئاسیان بەهۆی گەشت کردنیان بۆ گەشت و گوزاری تایلاند و شوێنەکانی تر، بۆ بەسەربردنی و ڕابواردن و تێرکردنی (جنسیان) لەڕێگەی ناشەرعی، وە (٥،٢) ملیۆن لە ئافرەت و پیاویان لەوڵاتە یەکگرتوەکانی

[1]. ئەم ژمارانەم لەکتێبی(همسة في اذن شاب) وەرگرتوە

ئەمریکا هەن. ئەم نەخۆشـیە ڤایرۆسـەکەی دەگوازرێتـەوە بەپەیوەنـدی ناشـەرعی سێکسی زۆرجار وەك ڕاپۆرتە پزیشکیەکان ئاماژەیـان پـێ کـردووە لـەڕێی دەسـت لەملانێ و ماچکردنی زۆر دەگوازرێتەوە. ئەم نەخۆشـیە دەبێتـە هـۆی هـەوکردنی (الاحلیل) لەپیاوان و هەوکردنی منداڵـدان لـە ئافرەتـان و جـاری واش هەیـە ئـەم هەوکردنە سەردەکێشێ بـۆ هـەوکردنی حـەوز و منـداڵ نـەبوون و ئیشـێکی زۆر و بەردەوام لەمنداڵداندا، لەگەڵ لێ تکانی ئاوەکە کێمێکی زۆرو ئێشیشی لەگەڵە.

**نەخۆشی سێ یەم: نەخۆشی هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ ( الهربز التناسولی):**

نەخۆشی سێ یەم کە بەهۆی (مومارەسەی) سێکسی ناشەرعی تووشی مـرۆڤ دەبێـت نەخۆشـی هـەوکردنی کۆئەنـدامی زاوزێ (الهربـز التناسـولی) ئەمـەش ڤایرۆسێکە لەڕێگای سێکسی ناشەرعی و دەست لێدانی شوێنی تووشـبوو، لیکـی دەم دەگوازرێتەوە، تووشبوو تووشی کۆمەڵێك پورك و زیپکەی بـەئێش دەبێـت لـە کۆئەندامی زاوزێی پیاو و ئافرەت ئەم نیشانەیە بۆ ماوەی دوو هەفتە تـا مانگێـك بەردەوام دەبێت، دوایی بزردەبێت و جارێکی تر سەرهەڵدەداتەوە بەدرێـژایی سـاڵ، ئامارەکان وانیشان دەدەن کە زیاتر لە (٣٠) ملیـۆن کـەس ئێسـتا هـەڵگری ئـەم ڤایرۆسەیە.

**نەخۆشی چوارەم: الزهری:**

(زوهری) بەهۆی (مومارەسەی) سێکسی نـا شـەرعی یـەوە تووشـی مـرۆڤ دەبێت، ئەم نەخۆشیە ترسناکە و سـەرجەم لاشـەی مـرۆڤ دەگرێتـەوە، ئەگـەر زوو

چارەسەر نەکریێ دوای چەند ساڵێك چەندین جێماوی ترسناك لەسەر لاشەی مرۆڤ بەجێ دەهێڵێ، سەرەتا نیشانەکانی زۆر بەسوکی دەردەکەون کە جێگەی گرنگی پێدان نین، بەلاّم دواتر هێرش دەکاتە سەر گشت لاشەی بەهۆی زینا و نێربازی و ماچکردن دەگوازرێتەوە، بەپێی ئامارێك کە لە گۆڤاری ( peditvic clinics of north amrica) بلاّوکراوەتەوەو دەڵێت، ئەم نەخۆشیە بۆتە دەردێکی گشتگیر لە ڕووسیا بە ڕێژەی (٢٠) بەقەدەر پێشوو لەزیاد بووندایە، پێشتر لە هەر (١٠٠) هەزار کەس (٤) کەس تووش دەبوو ئێستا زیادی کردووە بۆ هەر (١٠٠) هەزار کەس (٢٦٣) کەس بەم نەخۆشیەوە گرفتارە.

**پێنجەم: نەخۆشی هەوکردنی حەوز:**

نەخۆشی پێنجەم کە بەهۆی زینای ناشەرعی تووشی مرۆڤ دەبێت، نەخۆشی هەوکردنی حەوزە کە لە ئافرەتان هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ (جهازی تناسلی) و منداڵدانیان تووشی هەوکردن دەبن، بەپێ ئامارەکان زیاتر لە (٢،٥) ملیۆن لە ئافرەتانی ئەمریکا سەردانی نەخۆشخانە دەکەن بۆ ئەم نەخۆشیە.

**شەشەم: هەوکردنی ئەندامی زاوزێی پیاو (الاحلیل):**

ئەم نەخۆشیە تووشی ڕێڕەوی میزکردنی پیاو دەبێتەوە، هەندێك (افرازات) دەردەکات کێمی لەگەڵە، گواستنەوەشی لەڕێگەی زیناکردنەوەیە زۆریش بلاّوە، سالاّنە چەندین ملیۆن کەس لەجیهان تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن و زۆربەی دەبێتە هۆی نەزۆکی ئافرەتان.

تێبینی، ئیسلام سورە لەسەر دروستکردنی کۆمەڵگایەکی داوێن پاك و

تەندروست، ڕێگای گونجاو و تەندروستی داناوە، بۆتە هۆی ئەوەی کۆمەڵگای موسڵمانان تووشی گرفتی نەخۆشیە ترسناکەکان نەبنەوە، ئاگاداربە ئەوانەی تووشی ئەم نەخۆشیە کوشندانە دەبن، زیاتر ئەم وڵاتانەن کە لە ئیسلام دوورن و کار بە بەرنامە خودا ناکەن، بۆیە ئەم وڵاتانە زیاتر تووشی ئەم نەخۆشیانە دەبن وەك وڵاتە یەكگرتوەکان، ئەوروپا، باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا وەك هند، تایلاند، فلیپین، وەهەندێك وڵاتی ئەفریقی وەك جەزائیر، کینیا، ئەفریقیای ناوەڕاست، دیارە چارەسەرکردنی نەخۆشیە (جنسیەکان) بەم جۆرە نابێ کە ئەوروپا پێشنیاری بۆ دەکات بە بەکارهێنانی جۆرەها ڕێگا کە تاوەکو ئێستا ڕۆژ بەڕۆژ نەك چارەسەر نەکراوە بەڵکو ڕوو لەزیادیە.

تاکە چارەسەر، یەك ڕێگایە کە قورئان ئاماژەی پێ کردووە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ (الإسراء:٣٢) واتە: (هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناه و تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە). هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ ﴾ (الأنعام:١٥١) واتە: (نزیکی گوناه و تاوانەکان مەکەون، چ ئەوەی کە ئاشکرا بووە و چ ئەوەی کە شاراوە و پەنهان بووە).

پرسیارێك لێرە دا دروست دەبێت ئاخۆ بۆچی لەناو موسڵمانان ڕۆژ بەڕۆژ ئەم نەخۆشیانە ڕوو لەزیاد بوونن، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لتتبعن سنن من قبلكم شبراً بشبر و ذراعاً بذراع، حتي لوسلكوا جحر ضب لسلكتموه – قلنا يارسول الله اليهود و النصاري؟ قال فمن))[1] واتە: ڕۆژگارێك دێت ئێوە بەدوای میللەتانی پێش خۆتان دەکەون بست بەبست و پێ بەپێ هەتا وای لێ دێت ئەگەر

[1]. رواه البخاري

بچنە ناوکونی بزنمشك ئێوەش ڕێی ئـەوان دەگـرن، وتمـان ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) مەبەستت یەهودی و نەسرانییەکانە فەرمووی ئەی کێ، واتە مەبەستم ئەوانە.

# گرفتی سێیەم:
# ئاوهێنانەوە بەدەست (إستمناء)، هۆکار، چارەسەر

یەکێکی تر لەو گرفتانەی تووشی بەشێك لەگەنجان دەبن، هێنانەوەی ئاوە لەڕێی دەست، لەڕووی شەرعەوە واپێناسە دەکرێت. ئاوهێنانەوە بەڕێگایەکی ناشەرعی.

**حوکمی شەرعی ئەم کردەوەیە:**

زانایان قسەو باسیان زۆر لەسەر ئەم کردەوەیە کردووە، دەتوانین بەپێی ووتەی زانایان بەسێ حوکم پۆلینی بکەین:

**یەکەم: حەرامە:**

ئاوهێنانەوە بەدەستی خۆی بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەنی خێزان بێ و نەترسێ تووشی زیناکردن بێ، ئەوا حەرامە هەروەها (وهبة الزحیلی) دەڵێ: (ویحرم الاستمناء) لقوله تعالي:﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴾ (المؤمنون:٥–٧) واتە: (ئەوانەش کە پارێزەری داوێنی خۆیانن جگە لەگەڵ هاوسەران و کەنیزەکەکانیاندا نەبێت، کە ئەوە جێگەی لۆمەو سەرزەنشت نییە، (لەبارودۆخی نائاساییدا بەهۆی جەنگەوە ئافرەتانی موسڵمان دەکەونە دەست دوژمنان و دەستدرێژی بێ سنوور دەکرێتە سەریان، دوور نییە ئافرەتانی دوژمن

بکەوێتە دەست ئیمانداران، ئەو کاتە تەنها یەك کەس دەبێتە هاوسەری و بەڕێزەوە ڕەفتاری لەگەڵ دەکات). جا ئەوەی جگە لەو سنووورە دیاری کراوە، ڕێگە و ڕێبازی تر بگرێتەبەر، ئەو جۆرە کەسانە بە یاخی و لەسنوور دەرچوو دەژمێردرێن.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((اذا احدكم اعجبته المرأة فوقعت في قلبه فليعمد الي امرأته فليواقعها فان ذلك يرد مافي نفسه....))[1] واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئافرەتێکی بەرچاو کەوت و دڵی بۆی چوو بابچێتە لای خێزانەکەی خۆی (واتە لەگەڵی جووت ببێ) ئەوە وای لێ دەکات ئەوەی لەدڵ و دەروونیدایە لای ببات. کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگای شەرعی نیشاندا نەك ناشەرعی.

### دووەم: (مەکروهە):

ئەم کردەوەیە بۆ کەسێ کە خێزاندار بێ، بەڵاَم لایەنی توانای جووتبوونی زۆر بەهێزبێ و لەوە بترسێ تووشی زینا ببێ بەم کردەوەیە بیپارێزێ لە زیناکە ئەوا حوکمەکەی (مەکروهە). بەمەرجێك دڵنیابێ تووشی زینا دەبێ، ئینجا زانایان دەڵێن چونکە دوو زەرەر هاتۆتە پێش باشتروایە بەم زەرەرە بچوکە دەربازبێ لە زەرەرە گەورەکە.

### سێیەم: دروستە:

زانایان ئەم کردەویان بۆ کەسێك دروست دانا کە (یەقینی) بێ تووشی زیناکردن دەبێ و خێزانیشی پێك نەهێناوە و ناتوانێ (شەهوەتی) خۆی دابمرکێنێ،

---

[1]. رواه مسلم

لەم حاڵەتە بیکا بۆئەوەی وەك زانایان دەفەرموون (اخف الشرين) دوو زەرەر وشەڕ یەخەی گرتووی یەکێکان زینا و ئەویتر ئاوهێنانەوە بەدەست ئەوا ئەمەیان بکات باشترە لەوەی تووشی زیناکردن ببێت بۆ ئەو کەسە بە ئەندازەی دامرکاندنی (شەهوەتەکەی) بەدروستیان داناوە[1].

تێبینی، دیارە بەشێکی زۆر لەزانایان ئەم کردەوەیە یان بە (قەتعی) حەرام کردووە لەسەروی هەموویانەوە ئیمامی چوار مەزهەبەکە، بەبەڵگەی ئەم فەرموودانە ((ملعون من نكح يده)) واتە ئەو کەسە دورخراوەیە لە ڕەحمی خودا کە زینا بەدەستی خۆی بکات ((سبعة لاينظر الله اليهم ......منهم الناكح يده)) واتە: حەوت کەس هەن خودای گەورە تەماشایان ناکات، یەکێك لەوانە ئەو کەسەیە ئاو بەدەستی خۆی دەهێنێتەوە ((لاينكح احدكم لنفسه بيده فيأتي يوم القيامة وهي حبلى)) واتە: هیچ کەسێك ئاو بەدەستی خۆی ناهێنێتەوە ئەگەر وای کرد لەڕۆژی دوایی دێت بەسکی پڕەوە. ئیمامی شەوکانی دەفەرمووێت: ئەم فەرمودەیەم بەم (لەفزە) نەبینیوە و سەنەدەکەشی بێ هێزە[2].

## وەسفی هەندێك زانا بۆ ئەم کردەوەیە:

گومان لەوەدا نییە ئەم کردەوەیە شتێکی ئاسایی و سروشتی نییە بۆ مرۆڤ، بەشێوەیەك سروشتی مرۆڤ بۆ تێرکردنی (شەهوەت) لە ڕێگای شەرعی لەنێوان پیاو و ئافرەت ئەنجام دەدرێت بۆیە هەندێك لە هاوەڵان وەك عەبدوڵلا کوڕی عومەر (خوا لێی ڕازیبێ) ناوی ئەم کردەوەیان ناوە (الناكح نفسه) یان (الناكح يمينه). واتە: (جووت بوون لەگەڵ دەرونی خۆت بکەی) یان (جووت بوون لەگەڵ دەستی خۆت بکەی).

---

[1]. ئەم حوکمانەم لەکتێبی (فقه الاسلامي و شباب بلامشاكل و همسة في اذن شاب، يسألونني) وەرگرتووە.

[2]. (شباب بلا مشاكل) ص٩٤

ئیمامی شەوکانی لەبارەی ئەم کردەوەیە دەفەرمووێت: ((ولا شك ان في هذا العمل حجنة، وخسة وسقط نفس وطرح حشمة، وضعف همة ولكن الله لين تحريمها)) واتە: گومان لەوەدا نییە ئەم کردەوەیە ناتەواو و عەیبە، ڕسواییە، ڕووخانی دەرونە، فڕێدانی شەرمە، بێ هێزی هیمەتە، بەڵاّم خودای گەورە لە حەرام کردنی نەرم بووە.

ئیبن عەزم دەفەرمووێت: ((ليس من مكارم الاخلاق، ولامن الفضائل)) واتە: ئەم کردەوەیە لەڕەوشت بەرزی نییە و لەچاکەکانیش نییە.

**زیانەکانی ئاوهێنانەوە بەدەست:**

هەر شتێك کە خودای گەورە لەڕێ شەریعەتە پیرۆزەکەی، کە ئیسلامە ڕێگای پێ نەدابێ مرۆڤ بیکات، تووشی چەندین زەرەرو وزیان دەبێت، تائێستا دەرنەکەوتووە کە ئاوهێنانەوە بەدەست ڕاستەوخۆ نەخۆشی لێ بکەوێتەوە، بەڵاّم زیادەڕەوی کردن لەم کارە دەبێتە هۆی هەوکردنی ئەندامی میزکردن و هەوکردنی ژورەوەی کۆئەندام بەتایبەتی (پرۆستات).

بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە: بۆ ڕاستی ئەم مەسەلەیە گەنجێك هاتەلام چاوکانی پڕبوون لەگریان، ووتی مامۆستا من بۆ ماوەیەکی زۆرە تووشی ئەم کردەوەیە بومەو واتە (ئاوهێنانەوە بەدەست)، ئێستا ئەندامی میزکردنم تووشی هەوکردن بووەو کونی میزکردنم تەسك بۆتەوە و لەکاتی میزکردن زۆر ئازارم دەدات و لەدەرونەوە زۆر نەخۆشم بەهۆی ئەم کارە چارەیەکم بۆ بدۆزەرەوە، سوپاس بۆ خودا دوای ئەوەی کە چارەسەرمان بۆ دۆزییەوە لەڕێگای شەرع، وازی لەم کارە هێنا و ئێستا زۆرباشە، جگەلەوەش ئەم کردەوەیە کاردەکاتە سەر بێ هێزی سێکسی لەکاتی ژنهێناندا.

**چۆن خۆت لەم کردەوەیە دەپارێزی:**

گەنجی بەڕێز، بۆ چارەسەری ئەم کارە و خۆپاراستن دەبێ ئەم ڕێگایانە بگریتەبەر:

**یەکەم: تەقوا:** خودای گەورە بەمەرجی داناوە هەر کەسێك تووشی گرفتێك بوو، تەقوادار بێ دەرووی لێ دەکاتەوە، وەك دەفەرموویت: ﴿ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴾ (الطلاق:٢-٣) واتە: (جا ئەوەی لە خودا بترسێت و پارێزکار بێت، ئەوە خودا دەرووی لێ دەکاتەوە... لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و خۆی پێی نازانێت، جا ئەوەی پشت بە خودا ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە، بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی خودا کارو فەرمانی خۆی بەئەنجام دەگەیێنێت، بێگومان خودا بۆ هەموو شتێك نەخشەیەکی دیاریکراوی بڕیارداوە (کە دەبێت پەیڕەو بکرێت). هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴾ (الطلاق:٤) واتە: (جا ئەوەی کە لە خودا بترسێت و پارێزکار بێت، ئەوە خودا کاری بۆ ئاسان دەکات).

**دووەم: ئاگاداری وچاودێری خودای گەورە:** خودای گەورە بەردەوام ئاگای لێتە وەك دەفەرموویت: ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ (الحدید:٤) واتە: (جا لەهەر شوێنێك دابن ئەو زاتە لەگەڵتان دایە و پێتان دەزانێت، دڵنیابن کە خودا بەهەموو ئەو کاروکردەوانەی ئەنجامی دەدەن بینایە). هەروەها دەفەرموویت: ﴿ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾ (الشعراء:٢١٨-٢١٩) واتە: (ئەو

زاتەی کە دەتبینێت کاتێك هەڵدەستێت لە شەوگاردا دەیپەرستیت. ئەو زاتە تۆ دەبینێت کە چۆن لەڕیزی سوژدەبەراندا هەڵسوکەت دەکەیت). وە دەفەرمووێت: ﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴾ (غافر:١٩) واتە: (ئەو خودایە هەمیشە چاوە خیانەتکارو ناپاکەکان دەناسێت و دەزانێت چی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە).

**سێیەم: هەوڵبدە پلەی چاکەکاران بەدەست بهێنە:** وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((أن تعبد الله كأنك تراه، فأن لم تكن تراه فإنه يراك))[1] واتە: ئەوها خواپەرستی بکە وادابنێ تۆ خودا دەبینی، ئەگەر تۆش خودای گەورە نەبینی خودا تۆ دەبینێ.

**چوارەم: خۆڕاگربە، گوناه مەکە:** خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ (البقرة:١٥٣) واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە داوای کۆمەك و یارمەتی لە خودا بکەن بەهۆی ئارامگرتن و نوێژکردنەوە، دڵنیابن کە خودا یارویاوەری خۆگرو ئارامگرانە).

**پێنجەم: لەگەڵ دەرونی خۆت بجەنگێ سەردەکەوی:** هەوەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (العنكبوت:٦٩) واتە: (ئەوانەش لەپێناوی ئێمەدا و بۆ بەدەست هێنانی

[1]. رواه البخاري

ڕەزامەندی ئێمە، هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بەخودا بەڕاستی ئەوانە ڕێنموونی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاك و دروستی خۆمان (کە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئێمە لەدوایە)، بێگومان خودای پەروەردگار هەمیشە لەگەڵ چاکەکارانە).

**شەشەم: چاوگرتن لە تەماشاکردنی ئافرەتان:** خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ (النور:٣٠) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لەسەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها ناموس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکتر و پوختترە بۆیان بۆ دڵ و دەرون و ڕواڵەت و ڕۆح و لاشەیان) بەڕاستی خودا ئاگادارە بەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن.

**حەوتەم: بەهەشت بۆخۆت زامن بکە:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((من یضمن لي مابین لحییه ورجلیه أضمن له الجنة)) واتە: هەرکەس نێوان شەویلاگ (واتە زمان) و، نێوان قاچەکانی (واتە دامێنی) زامن بکا من بەهەشتی بۆ زامن دەکەم.

**هەشتەم: واز لەبرادەری خراپ بێنە:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((الرجل علي دین خلیله فلینظر احدکم من یخالل))[1] واتە: مرۆڤ لەسەر ئاینی برادەرەکەیەتی بابزانێ کێ دەکاتە برادەری خۆی.

---

[1]. رواه الترمذي

**نۆیەم: ژن هێنان:** ئەم ڕێگایە باشترین چارەسەرە وەك پێغەمبەر (ﷺ) بانگی گەنجان دەکات ودەفەرمووێت: ((یامعشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج)) واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان ئەوەی توانای ژنهێنانی هەیە با ژن بهێنێ.

**دەیەم: بەڕۆژو بوون:** هەمان فەرموودەی پێشوو کە دەفەرمووێت: ((ومن لم یستطیع فعلیه بالصوم فانه له وجاء)) واتە: هەر کەسێك نەیتوانی ژن بهێنێت با بەڕۆژوو بێ، ئەم ڕۆژووە دەیپارێزی لە شەهوەت.

**یانزەیەم: زیادکردنی خواپەرستی:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((من کان همه الاخرة جمع الله شمله وجعل غناه في قلبه، واتته الدنیا وهي راغمة، ومن کانت نیته الدنیا فرق الله علیه ضیعته وجعل فقره بین عینیه ولم یأته من الدنیا الاماکتب له))[1] واتە: هەرکەسێك خەمی دوارۆژ بێت خودای گەورە کارو فەرمانی بۆ کۆدەکاتەوە و دڵی دەوڵەمەند دەکات، دونیای بۆ دێنی و ملکەچی دەکات وە کەسێك نیازی دونیا بێت خودای گەورە خێر و بێری لێ پەرت و بڵاو دەکات هەژاری لەنێوان چاوانیدا دەگیرێ لە دونیادا هیچی بۆ نابێ تەنها ئەوە نەبێ کە بۆی نوسراوە.

**دوانزەیەم: خۆت لەتەنیایی بپارێزە:** واتە بەتەنها لەژوورێك و لەشوێن مەمێنەوە وەك ئیبن عومەر دەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((نهی عن الوحدة ان یبیت الرجل وحده ویسافر وحده))[2] واتە: پێغەمبەر (ﷺ) بەتەنها

[1]. رواه احمد
[2]. رواه احمد

بوونی قەدەغە کردووە بەشێوازێك مرۆڤ بەتەنها لەماڵەوە بێت یا گەشت بکات بەتەنها.

ڕەچاوکردنی ئەم ئامۆژگاریانە کەلە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) وەرگیراوە دەتپارێزێ لە کردەوەی ئاوهێنانەوە بەدەست.

## گرفتی چوارەم:
## پێنجەم: تەماشاکردنی فیلمی ڕووت، بەتایبەت لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە، هۆکار، چارەسەر

لەگەڵ پێش کەوتنی دونیای زانست و تەکنەلۆژیا، جۆرەها ئامێری پێشکەوتوو دەرکەوتووە سود و قازانجیان یەکجار زۆرە ئەگەر بەپێوانەیەکی شەرعی بەکاریان بهێنین، لەبەرامبەریشدا زەرەرو زیانیان زۆرە ئەگەر بەڕێگایەکی ناشەرعی بەکاریان بهێنین. گرفتێك لەو گرفتانەی تووشی گەنجان بووە لەڕێگەی سیدی و ئینتەرنێت و تەماشاکردنی فیلمی ڕووت و سێکسی یە، کە بۆتە هۆی تێکدانی ڕەوشتی گەنجان، چەندەها خێزانی هەڵوەشاندۆتەوە و ئارامی لێ هەڵگرتوون و جۆرەها کردەوەی ناسروشتی ئەنجام دەدەن و هۆشیان بەتەواوی لەدەست داوە، چەندین ڕووداوی دڵتەزێن ڕوویداوە بەم هۆیەوە ئاگری (شەهوەتی) پێ هەڵدەستی و تووشی زیناکردن و ئاوهێنانەوە بەدەست و نێربازی و جۆرەها کردەوەی ناشرین دەبن.

**حوکمی شەرعی ئەم کردەوەیە:**

لەکتێبی فتاوي علماء البلد الحرام [1] دەربارەی تەماشاکردنی ئافرەت لەلایەن پیاوەوە لەشاشەی تەلەفزیۆندا دەڵێت: يحرم النظرة لما يسبب ذلك من الفتنة بها وقال تعالي: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ (النور:٣٠) واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە پیاوانی

[1]. فتاوي علماء البلد الحرام

ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لەسەرنجدانی ئافرەتی نامەحرەم) هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکترو پـوختتره بۆیـان (بـۆ دڵ و دەرون و ڕواڵەت و ڕۆح و لاشەیان) بەڕاستی خـودا ئاگـاداره بـەو هەڵسـوکەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن).

(هذه الآیة تعم النساء المصورات و غیرهـن سـواء کـن فـی الاوراق او شاشـة التلفازوغیر ذلـك)[1]. واتە: تەماشاکردنی حەرامە چونکە هۆکارە بۆ فیتنـە و ئـەم ئایەتە بەڵگەیە و گشتی یە، وێنەو جگەلە وێنـەش دەگرێتـەوە جـا ئەمـە لەسـەر کاغەز بێ یان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن بێ یان جگەلە ئەوانە هەمووی دەگرێتەوە. هەروەها گومان لەوەدانییە تەماشـاکردنی ئـافرەتی ڕووت لـەم شـەریعەتە پـیرۆزە ئەولاترە کە حەرام بێ، خودای گەورە کە فەرمان دەکـات نافـەرمووێ تـەنها زینـا مەکـەن بـەڵکو دەفـەرموویت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ (الإسراء:٣٢) واتە: (هەرگیز نەکەن تـوخنی زینـا بکـەون و لێـی نزیـك ببنـەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناه و تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە).

ئیمامی قورتوبی لە تەفسیری ئەم ئایەتـەدا دەفـەرموێت: ((قـال العلمـاء قوله تعالي ولا تقربوا الزنی: ابلغ مـن ان یقـول ولاتزنـوا فـان معنـاه فلاتـدنوا مـن الزنـا)) واتە: زانایـان دەفـەرموون فـەرموودەی خـودای گـەورە کـە دەفـەرموویت (ولاتقربوا الزنی) (بەلیغ ترە) لەوەی بلێ زینا مەکەن چونکە ماناکەی واتە لە زینا نزیك مەکەونەوە.

کەواتە هەر نزیکبوونەوەیەك ببێتە هۆی زیناکردن حەرامە، لەناو ئەوانـەش تەماشاکردنی فیلمی ڕووتە بەهەموو شێوەکانیەوە، کەواتە تەماشاکردنی حەرامە،

[1]. فتاوي علماء البلد الحرام ص ١٩٠١

ئەوەی گوناهی گەورەترە لەوە ئەوەیە کەبلاّوی دەکاتەوەو لەسەرەتا هاوکاری کردووە بەهەرشێوەیەك بێ. خودای گەورە هەڕەشەی لێ کردوون دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ (النور:١٩) واتە: بەڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن زینا و تاوان لەناو ئەوانەدا باوەڕیان هێناوە بلاّوبێتەوە، سزای پڕ ئێش و ئازار لەم جیهان و لەو جیهان بۆیان ئامادەیەو خودا خۆی چاك دەزانێت (سەرەنجامی زیناو شەروالّ پیسی بەرەو کوێ دەچێت) ئێوە نایزانن.

**ئەی گەنج چارەسەری ئەم گرفتە چۆن دەکەی؟**

بۆ چارەسەری ئەم کردەوە ترسناکە پێویستە چەند قۆناغێك بەکاربهێنی:

**قۆناغی یەکەم: لێپرسینەوە لەگەلّ خۆت بکەو ئەم پرسیارانە لەخۆت بکە:**

ئایا خودات خۆش دەوێت؟

ئەگەر خۆشت دەوێت بۆ سەرپێچی دەکەی؟

چۆن تام و لەزەت لەکارێك دەکەی کەخودا پێی ناخۆشە؟

ئایا شەیتانت خۆش دەوێ؟

ئەگەر خۆشت ناوێ چۆن گوێڕایەڵی دەکەی؟

ئایا لەبەرچی ئەم هەموو کاتەت لەگوناه بەسەربرد؟

ئایا چی دەکەی ئەگەر لەوکاتەی خەریکی گوناه بیت و مردی؟

ئایا هیوای ئەوەت دەخواست ئەوها بمری؟

ئایا خۆشی بەهەشت دەگۆڕیەوە بەتام و لەزەتێکی کاتی لە دونیا؟

ئایا حۆریەکانی بەهەشت بەم کارە ناشیرینە دەگۆڕیەوە؟

ئایا تۆ ئەوەندە بێ هێزی؟

ئایا هەست بەخۆشی دەکەی لەکاتێك سەرپێچی خودا دەکەی؟

ئایا پێت خۆشە شەیتان پێت پێبکەنێ؟

کوا هێزی و ویست و ئامانجت، بۆچی وات لێ هات؟

ئەم پرسیارانە لەخۆت بکەو وەلاٌمیان بدەوە و لەگەڵ خۆت ڕاست بە[1].

**قۆناغی دووەم: تەوبەی (نەصوح) ڕابگێنە:**

تۆبەی خۆت ڕابگێنە بەبێ دوودڵی و دوای مەخە ئەگەر لەدوای تۆبە کردن بمری وەك ئەوەیە هیچ گوناهت نەکردبێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((التائب من الذنب كمن لاذنب له)) واتە: (ئەوکەسەی تەوبە دەکات لەتاوان وەك ئەوە وایە گوناهی نەکردبێ) ئێستا ئامادەی بجەنگی لەگەڵ دەرونت و لەگەڵ شەیتان، ئێستا دەتوانی جڵەوی دەرونی خۆت بگری وجڵەوی خۆت نەدەیتە دەست دەرون و شەیتان، ئایا ناتەوێ تام وچێژ لەخواپەرستی وەربگری؟

[1]. الدليل التساهل للنجاح

**کەواتە بەم کردەوانە هەڵسە و ئەنجامیان بدە:**

**رۆژی یەکەم:** دەرگاکانی شەیتان دابخە، سیدی و وێنە و پێگەی ئەلیکترۆنی سێکسی و ئەوانەی پەیوەندی بەم کردەوە حەرامانە هەیە، لە هاوڕێی خراپ و شوێنی خراپ دایبخەو هەست بەخۆشی تۆبەکردن بکە، لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەت بەخەتێکی جوان بنوسە (ان الله یراك) خودای گەورە دەتبینێ لەجێی ئەوانە ئەم سید و پێگە ئەلیکترۆنیانە بەکاربهێنە کە قورئان و ئامۆژگاری ئایینی تێدایە، دواتر چاودێرییێك لەسەر ئینتەرنێتەکەت دابنێ بۆ ئەوەی ئەم کارەت بۆ قەدەغەبکات.

**رۆژی دووەم:** لەرۆژی دووەم هەوڵبدە لە قورئان و لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و پەرتوکە ئایینیەکان خۆشیەکانی بەهەشت بناسی و چێژی لێ وەرگری.

**رۆژی سێیەم:** بڕیاری تەواو بدە، نەگەڕێیەوە و (عەزمت جەزم) بکە.

**رۆژی چوارەم:** شەڕ لەگەڵ گومان و دوودڵی شەیتان و دەرونت دەست پێ بکەو بەسەری دا زاڵ بە.

**رۆژی پێنجەم:** هێزی خۆت تاقی بکەوە بەرامبەر بەدەرونت، بەرامبەر بە (شەهوەتت) بزانە بەسەری دا زاڵ دەبیت. دواتر لەخواپەرستی بەکاری بهێنە.

**رۆژی شەشەم:** سەرکەوتنی خۆت ڕابگەیێنە. ئەی گەنج ڕاستە لەم چەند ڕۆژەدا ماندووبوویت بەڵام ئێستا هەست بەخۆشی ئیمان دەکەیت، هەست بەوە دەکەیت، بەسەر دەرونی خۆت زاڵ بووی، هەست دەکەی ئێستا بۆ خۆت جڵەوی خۆت بەدەستە، لەم کردەوانە تەنها مەبەستت ڕازی بوونی خودا و بەهەشتی نەبڕاوە بێت[1] .

[1] الدليل التساهل للنجاح

## گرفتی پێنجەم:

## نێربازی (لواطة)، هۆکار، چارەسەر

گرفتێکی تر لەم گرفتە (جنسیانەی) تووشی بەشێکی زۆر دەگمەن لە گەنجان دەبێ، نێربازییە. لەگەڵ ئەوەی ئەم کردەوەیە لە کوردستان سوپاس بۆ خودا ڕێژەی یەکجار کەمەو زۆر ڕوونادات، بەڵام لەگەڵ ئەوەش خەڵکانێك هەن ئێستا تووشی ئەم گرفتە بوونە، هەرچەندە زۆر دڵتەنگم کە باسی ئەم گرفتە دەکەم، چونکە بەڕاستی تابلۆیی دیاردەیەکی ترسناك و نابەجێ و ناشرینە، بەڵام بۆ خۆپاراستن لەم دیاردەیە بەکورتی ئاماژەی پێ دەکەین. ئەوروپا زۆر هەوڵدەدات ئەم دیاردەیە بەشتێکی سروشتی دابنێت تاوای لێ هاتووە هەندێك لەوڵاتە ئەوروپییەکان بڕیاری قانونیان داوە لە پەرلەمان تا نێر لە نێر مارەبکەن.

**ئەم کردەوەیە پێچەوانەی (فیترەتی) مرۆڤە:**

ئەم دیاردەیە لەگەڵ (فیترەی) پاکی مرۆڤ ناگونجێ، (دکتۆر یوسف قەرزاوی) دەڵێت: ئەم کردەوەیە لەپێش (گەلی لوت) کەس نەی کردووە. خودای گەورە دەفەرموویت:﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (العنكبوت:٢٨) واتە: (یادی (لوط)یش بکە کاتێك بە قەومەکەی ووت: ئێوە بەڕاستی تاوانێکی گەورە دەکەن، ئێوە گوناهێکی ناشیرین ئەنجام دەدەن، هیچ کەس بەر لە ئێوە بەکاری وا هەڵنەساوە)!

گەلی لوت ئەم دیاردەیان ئەنجامدا، پێغەمبەرەکەیان (سەلامی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردن وازی لێ بهێنن، ئەگەرنا تووشی جۆرەها سزا دەبن لەلایەن خودای گەورە، وەك دەفەرموویت:﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا

وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾ ﴾ (هود:٨٢–٨٣) واتە: (جا کاتێك فەرمانی ئێمە بۆ تیاچوون هات، شارۆچکەکەیانمان ژێرەوژوور کرد و بە قوڕی سوورەوەکراوی وەك بەرد، چین لەسەر چین بەردبارانمان کرد. هەموو ئەو بەردانە دیاری کراو بوون، لەلایەن پەروەردگارتەوە (کە بدات بەسەر تەوقەسەری کێدا) ئەم کارەسات و ئەم بەردبارانەش وەنەبێت زۆر دوور بێت لەستەمکارانەوە (لەهەموو سەردەمێکدا، کاتێك ڕۆدەچن لە تاوانکارییدا)).

**زەرەرو زیانی کردەوەی نێربازی:**

هەموو کردەوە ناشەرعیەکان زەرەرو زیانیان لەدونیا هەیە ئینجا لەدوا ڕۆژ:

**١. ئایدز:**

بەپێی ڕاپۆرتی (ناوەندی پاراستن بۆ نەخۆشیەکان لەئەمریکا) زۆربەی ئەوانەی تووشی نەخۆشی ئایدز دەبن لەئەنجامی نێربازیە.

- بۆ زەرەروزیانی و ژمارە و شوێن و نیشانە و هەموو ئەوانی تر، لە گرفتی دووەم باسمان لێوە کردووە.

**٢. توشبوون بەنەخۆشی دەرونی:**

لێکۆڵینەوەی زانستی نوێ دەریخستووە نێربازی هۆکارێکە بۆ توشبوونی بە نەخۆشی دەرونی.

**٣. شێرپەنجەی کۆم (سرطان الشرج).**

ئەم نەخۆشییە لەناو ئەو کەسانە بلاۆە کە کردەوەی نێربازی دەکەن و زۆریان

تووشی ڤایرۆسی (H.P.V) (Human papillomavirus) دومەڵی گوێیی لە مرۆڤ دەبن.

## حوکمی نێربازی لەئیسلامدا:

کردەوەی نێربازی لە تاوانە گەورەکانە و خراپترین گوناهە، خودای گەورە ئەو گەلەی ئەم کردەوەی کردووە بە سزایەك سزا داوە کە هیچ گەلێکی پێ سزا نەدراوە، وەك لەم ئایەت و فەرموودانە دەردەکەوێت:

١. ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ (الأعراف:٨٠-٨٤) واتە: (یادی (لوت پێغەمبەریش بکە کاتێك بە قەومەکەی وت: چۆن ئێوە گوناه و تاوانێکی وا دەکەن کە تائێستا هیچ کەس پێش ئێوە لە جیهاندا گوناه و تاوانی وای نەکردووە؟! چونکە بەڕاستی ئێوە ئارەزوی ( (زایەندی (جنسی )خۆتان لەگەڵ پیاواندا ئەنجام دەدەن لەجیاتی ژنانی هاوسەرتان، نەخێر ئێوە قەومێکی ناپوخت و سنووربەزێن و زیادەڕەون. وەڵامی قەومە نالەبارەکەی تەنها ئەوەبوو کە ووتیان: ئەوانە شاربەدەرکەن چونکە ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاك ڕادەگرن (داوێن پاکن و وەك ئێمە ناکەن)! ئێمەش لوت و خانەوادەکەیان ڕزگارکرد، جگەلە هاوسەرەکەی، چونکە ئەویش لەو کەسانە بوو کە تیاچوون (لەبەر ئەوەی باوەڕی بە لوت

پێغەمبەر نەبوو). ئەوسا (بەردمان) بەسەردا باراندن، جا تەماشا بکە و سەرنج بدەو پەند وەرگرەو بزانە، سەرئەنجامی تاوانباران و بێ ڕەوشتان چۆن بوو.

٢. ﴿ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِى سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلْنَا عَـٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴾ (**الحجر:٧٢-٧٦**) واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ) سوێند بەگیانی تۆ ئەوانە لە سەرخۆشی خۆیاندا بۆ گوناهـ لەسەرگەردانیدا دەتلێنەوە. جا هەر لە بەرەبەیاندا دەنگە سامناکەکە و بوومەلەرزەیەك یەخەی پێگرتن. ئینجا شارەکەمان ژێراوژوور کردو بە (سەنگگڵ) بەرد بارانمان کردن.

٣. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: ((من وجدتموە يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به))[١] واتە: هەر کەسێکتان بینی کردەوەی گەلی لوتی ئەنجام دەدا واتە (نێربازی) هەردووکیان بکوژن.

٤. پێغەمبەر دەفەرموویێت: ((لعن الله من عمل عمل قوم لوط لعن الله من عمل عمل قوم لوط ثلاثاً))[٢] واتە: خودای گەورە نەفرەتی لەو کەسە کردووە کە کردەوەی گەلی لوت دەکەن، سێ جار دووبارەی کردەوە.

---

(١). صححة الباني في صحيح ترمذي

(٢). رواه احمد و حسنه شعيب

## گرفتی شەشەم:
## مەی خواردنەوە (الشراب)، هۆکار، چارەسەر

یەکێکی تر لــەم گرفتانــەی تووشــی گــەنجانمان دەبــن مــاددەی سـڕکەر و بــێ هۆشکەرە، ژمارەیەکی زۆر تووشی ئەم گرفتــەبوون بەتایبــەتی خواردنــەوەی مــەی (شەراب).

**پێناسەی مەی (الخمر):**

مەی لە زمانەوانی دا بە مانای گوشینی ترێ کــە ببێتــە هــۆی بــێ هۆشــی مرۆڤ، بۆیە پێی گوتراوە (خمر) چونکە عەقڵی مرۆڤ دادەپۆشێ.

### پێناسەی مەی لە شەرع:

لە شەرعدا بە هەموو ماددەیەکی بێ هۆشکەر دەگوترێت کەم بێت یــان زۆر، لە ترێ دروست کرابێت یان لە گەنم یان لە جۆ یان لە خورما یــان لەشــتی تــر. بــە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ((کل مسکر خمر، و کل خمر حرام))[1] واتە: هــەموو بێ هۆشکەرێك خەمرە، وەهەموو خەمرێکیش حەرامە.

### حوکمی مەی لە شەرعدا:

مەی حەرامە بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و (ئیجماعی) زانایان.

---

[1]. رواه مسلم

## بەڵگەی حەرام بوونی مەی لە قورئان:

خودای گەورە مەی بەچەند قۆناغێك حەرام كردووە لەبەر چەند ڕووداوێكی جیاواز.

یەكەم ئایەت دابەزی فەرمووی: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾ (البقرة:٢١٩) واتە: (پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی عەرەق و قومار، پێیان بڵێ: لەو دووانە تاوان و گوناهێكی گەورە هەیە، هەرچەندە چەند سوودێكیان تێدایە بۆ خەڵكانێك، بێگومان گوناهەكەیان گەورەترە لە كەڵك و سوودیان، پرسیارت لێ دەكەن كەچی ببەخشن؟ پێیان بڵێ: هەرچیتان لێ زیادە دەتوانن بیبەخشن، ئا بەم شێوەیە خودای گەورە ئەم بەڵگە و فەرمانانەتان بۆ ڕوون و ئاشكرا دەكات بۆ ئەوەی بیربكەنەوەو (واز لەو شتانە بهێنن كە زیانیان زۆرترە لە سوودیان، وەچی بۆ هەردوو جیهانتان چاكە ئەوە بكەن). بەم ئایەتە كۆمەڵێك وازیان لە (شەراب) هێنا و گوتیان مادام زیانی زۆربێ سوودی كەم بێ).

ئایەتی دووەم دابەزی خودای گەورە فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾ (النساء:٤٣) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە نزیكی نوێژ مەكەون، لەكاتێكدا

ئێوە سەرخۆشن —ئەمە کاتێك بوو هێشتا عەرەق و مەی حەرام نەکرابوو— هەتا ئاسەواری سەرخۆشی نامێنێت و دەزانن چی دەڵێن (لەنوێژدا) و بە لەشی بێ نوێژیشەوە نوێژ مەکەن مەگەر ڕێبواربن و لە سەفەر دابن، هەتا خۆتان دەشۆن، خۆ ئەگەر نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون یان لەسەر ئاو گەڕانەوە، یان لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم لەیەککەون و ئاوتان دەست نەکەوت (بۆ خۆشووشتن و دەست نوێژگرتن) ئەوا تەیەموم بکەن بەخاکێکی پاك و (بەو خاکە دەست بهێنن بەسەر دەم و چاوو دەستاندا)، بێگومان خودا هەمیشە و بەردەوام لێ خۆشبووەو گوزەشت و چاوپۆشی هەیە. بەشێکی تر بەم ئایەتە وازیان هێنا بە تایبەتی لە کاتی نوێژکردن.

کۆتا ئایەت، دوابڕیار کە مەی حەرام کرد خودای گەورە فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ (المائدة:٩٠) واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە عەرەق و قومار و گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خودا لەو شوێنانەی کە خەڵك بەپیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج حەرام و حەلاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەر پیسن و لەکاروکردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازی و بەختەوەری بەدەست بهێنن (لەهەردوو جیهاندا) ).

بەم ئایەتە مەی بەتەواوی حەرام بوو، تا هاوەڵان فەرموویان مەی خواردنەوە حەرامیەکەی لە هەمووان توندترە.

**بەڵگەی حەرام بوونی مەی لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ):**

چەندین فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە لە سەر حەرام بوونی مەی:

١. قال رسول الله (ﷺ) ((كل مسكر خمر، وكل خمر حرام))[١] واتە: (هەموو سەرخۆشكەرێك شەرابە، وە هەموو شەرابێكیش حەرامە).

٢. هەروەها ((لعن رسول الله (ﷺ) ساقی الخمر و مسقاها و عاصرها و معتصرها وحاملها و المحمولة الیه ومبتاعها وءاكل ثمنها))[٢] واتە: (پێغەمبەر (ﷺ) لەعنەت لە شەراب خۆر و ئەوەی دەی گێرێ و ئەوەی دروستی دەكات و ئەوەی دەیگوشێ و ئەوەی هەڵی دەگرێ و ئەوەی باری دەكا و ئەوەی دەیفرۆشێ و ئەوەی پارەكەی دەخوا).

٣. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((من شرب الخمر فی الدنیا ثم لم یتب منها حرمها فی الاخرة))[٣] واتە: (هەر كەسێك شەراب لە دونیا بخواتەوە، شەرابی بەهەشتی لەسەر حرام دەبێت).

٤. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێت ((الخمر أم الخبائث))[٤]. واتە: مەی دایكی پیسیەكانە.

---

[١]. رواه مسلم
[٢]. رواه الطبرانی والبزاز
[٣]. رواه مسلم
[٤]. رواه مسلم

**(ئیجماعی) زانایانی ئیسلام لەسەر حەرامی مەی:** کۆی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و سەرجەم زانایان لەکۆنەوە تاکو ئێستا لەسەر ئەوە یەك دەنگن مەی زۆر بێ یان کەم حەرامە.

**سزای مەی خۆر:**

هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و زانایانی دوای ئەوان یەك دەنگن لەسەر سزای مەی خۆر، بەڵام لە ئەندازەکەی جیاوازیان هەیەلە نێوان (٤٠) تا (٨٠) جەلدە.

لە فقه الاسلامی (دکتۆر وهبة الزحیلی)دا دەلێت: ((قال جمهور الفقهاء حد الشرب والسکر ثمانون جلدة) لقول علی رض لله عنه (اذا شرب سکر و اذا سکر هذی، و اذا هذی افتری وحد المفتری ثمانون))[1] واتە: (جمهوری فوقهایەکان) گوتویانە سزای مەی خۆر ٨٠ جەلدەیە، لەبەر فەرموودەی ئیمامی عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) فەرمووی ئەگەر مەی خواردەوەو سەرخۆشی کرد، ئەگەر سەرخۆش بو وە وڕێنەی کرد، ئەگەر وڕێنەی کرد بوختان دەکات، سزای بوختان ٨٠ جەلدەیە. کەسیش (ئینکاری) لەم فەرموودەیە نەکردووە بۆیە بۆتە (ئیجماع).

ئەنەس دەفەرموێت:(أن النبی (ﷺ) أتی برجل قد شرب الخمر فجلدة بجریدتین أربعین قال وفعلة ابوبکر فلماکان عمر استشار الناس فقال عبدالرحمان اخف الحدود ثمانون فامر عمر[2].واتە: پیاوێکیان هێنا لای پێغەمبەر (ﷺ) شەرابی خواردبۆوە، ئەویش (٤٠) جەلدەی لێدا ئەبوبەکریش (خوا لێی ڕازی بێت)

---

[1]. فلم ینکر علیه احد فکان اجماعا. فقة الاسلامی ج٧ ص ٥٤٨٨

[2]. رواه مسلم

لە خەلافەتی خۆی هەروای دەکرد کاتێك عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) بووە خەلیفە ڕاوێـژی کـرد، عەبـدولڕەحمانی کـوڕی عـەوف (خـوا لێـی ڕازی بێـت) فـەرمووی کەمترینی (٨٠) یە عومەریش (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمانی بەوە کرد.

**حوکمی مەی خواردنەوە بۆ نەخۆشی:**

لە ناو کۆمەڵگای ئێمەدا قسـەیەك بـاوە بـۆ خواردنـەوەی مـەی بـە نـاوی نەخۆشی کە هەندێك دکتۆری بێ ئاگـا لـە شـەرعی خـودا دەڵـێن، بـۆ نەخۆشـی گورچیلە باشە. دیارە ئەم قسەیە ناشەرعیە و ئەوەی مەی یش بەکاربهێنێ تووشـی حەرام دەبێت بە پێی ئەم بەڵگانە:

١. لە (صەحیحی) بوخاری دا هاتووە دەفەرمویێت: عن ابی الـدرداْ قـال رسـول الله (ﷺ) ((ان الله انـزل الـداء وانـزل الـدواء وجعـل لكـل داء دواءَ فتـداوا ولاتتـداووا بـالحرام))[1] واتـە: پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرمووێت: خـودای گـەورە نەخۆشـی دابەزانـدووە چارەسەریشـی دابەزانـدوە وە بـۆ هـەموو نەخۆشـیەکیش چارەسەرێکی داناوە. ئێوە خۆتان چارەسەری بکەن، خۆتان بە شتی حەرام چارەسـەر مەکەن.

٢. لە (صەحیحی) موسلم دا دەفەرمووێت: پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد لەبارەی مەی فەرمووی: ((انه لیس بدواء ولكـن داء) واتە: چارەسەر نییە، بـەڵکو نەخۆشیە.

٣. لە (سنن)دا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((من تداوی بالخمر فـلا شـفاه الله))[2] واتە: هەرکەسێ بە مەی خۆی چارەسەر بکـات خـودا (شـیفای) بـۆ نانێرێ.

[1]. البخاری
[2]. صحیح مسلم

٤. ئیبن قیم جوزیـە دەفـەرموویّت: ((المعالجة بالمحرمـات قبيحـة عقـلا وشـرعاً والشـرع دليلـه الاحاديـث السـابقة امـا العقـل فهـو ان الله سـبحانه وتعـالى حرمـه لخبثـه)) واتە: (چارەسەرکردن بەشتی حەرام شتێکی خراپە، بـە بەڵگـەی عـەقڵی و شەرعی، بەڵگەی شەرعیەکە لەبەر ئەم فەرموودانـەی پێشـوو. بەڵگـەی عـەقڵیش ئەوەتا خودای گەورە حەرامی کردوە لەبەر پیسی))[1]

٥. لـە فـەتاوی (علمـاء البلـد الحـرام) دا دەربـارەی چارەسـەر بەشـتی حـەرام دەفەرموویّت: (لايجوز التداوى بما حرم الله من افيون اوالحشيشه او خمـر او نحـو ذلـك من مخدر او مسـكر)[2] واتە: دروست نییە خـۆت چارەسـەر بکـەی بەشـتێك خـودا حەرامی کردبیّ، وەك ئەفیون یان حەشیشە یان مەی یان هەرشتێکی سەرخۆشـکەر بیّ یان بیّ هۆشکەر.

## کێشەی مەی لە جیهان:

مەی خواردن بۆتە گەورەترین کێشە لە جیهان، ناتوانن چارەسەریشی بکـەن، چەندین هەوڵ دراوە، چەندین ملیۆن دۆلار لە قەدەغەکردنی خەرج کراوە لە ڕێگـای ڕاگەیاندن و دەزگاکان، بەڵام تا ئێستا ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوو لەزیاد بوون دایە، سیناتۆری ئەمریکی (ولیم فولبرایت) لە بارەی گرفتی مەی دەڵێت: (ئێمە گەیشتووینەتە سەر مانگ بەڵاّم تاکو ئێستا پیّ یەکانمان لە قوڕ و چڵپاوی مەی خواردنەوە نقوم بـووە) ئەمە کێشەیەکی گەورەیە و ئێستا لە ئەمریکا (١١) ملیۆن کەس هەمیشە مـەی دەخۆنەوەو لێی جیا نابنەوە و زیاتر لە (٤٤) ملیۆن مەی خۆر هەیە لە ئەمریکا.

---

[1]. جامع الفتاوى الطبية ص ٣١٦

[2]. فتاوي علماء البلدالحرام ص ١٧٠٧

پرۆفیسۆر (شاکین) دەڵێت: لە (٩٣٪)ی هاولاتیانی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا خەریکی مەی خواردنەوەن و (٤٠٪) پیاوەکان تووشی نەخۆشی بووینەو لە (٥٪) ئافرەتان توشبووینە[1].

## زەرەر و زیانەکانی مەی:

لە پێشدا ئاماژەمان پێ کرد کە هەر شتێك خودای گەورە حەرامی کردبێ مرۆڤ بیخوات ئەوا بێگومان پێشی سزای دوارۆژ تووشی سزای دونیا دەبێت، یەکێکیش لەوانە (شەرابە). خودای گەورە نەی فەرمووە مەی مەخۆن بەڵکو لەوەش زیاتر فەرموویەتی لێی دورکەونەوە (فاجتنبوه). کەواتە خواردنەوەی دەبێتە هۆی چەندین زەرەر و زیانی تەندروستی و کۆمەلایەتی و ئابووری و... هتد. بۆ زیاتر دوورکەوتنەوە لەم کردەوەیە زۆر بەکورتی کەمێك لەم زەرەر و زیانانە باس دەکەین.

### زەرەر و زیانی مەی بۆلایەنی تەندروستی مرۆڤ:

١. **کاریگەری لەسەر جگەر دروست دەکات:** بە هۆی مەی خواردنەوەی زۆر، جگەر تووشی هەوکردن دەبێت، ژانێکی زۆر لە سك پەیدادەبێت.

٢. **کاریگەری لەسەر دڵ دروست دەکات:** زەرەری مەی بۆ سەر دڵ ڕاستەوخۆیە، زۆرجار تووشی تێکدانی ژمارەی لێدانی دڵ دەبێت و پاڵەپەستۆی خوێن زیاد دەکات.

[1]. همسة في اذن شاب

**٣. ڕێژەی ترشی لە لەش زیاد دەكات دەبێتە هۆی:**

أ. دابەزینی ڕێژەی شەكر لە لەش، بەردەوام دابەزینی شەكر لە لەش دەبێتە هۆی لێدانی بەهێز لە مێشك.

ب. زیادبوونی ترشی لە میز، لەو حاڵەتەش لەسەر یەك كەڵەكە دەبێت، نەخۆشی تری لێ پەیدا دەبێت.

**٤. كاریگەری مەی لەسەر توڕەبوون:** خانەكانی توڕەبوون لە هەموان زیاتر تووشی زەرەر دەبن بەهۆی مەی خواردنەوە دكتۆر (براتر) دەڵێت: یەك پەرداغ مەی یان دوو دەبێتە هۆی كوشتنی هەندێك خانەی مێشك با مەیەكە كەمیش بێت ئەمەش (موعجیزەی) پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆ دەردەخات كە دەفەرموویت: ((ما اسكر كثیره فقلیله حرام)). واته:ئەوەی سەرخۆشكەربێ بڕە كەمەكەشی هەر حەرامە.

**٥. كاریگەری مەی لەسەر كردەوەی (جنسی):** دكتۆرەكان دەڵێن، مەی ئارەزووی جووت بوون زیاد دەكات و كۆنترۆڵی لەسەر (شەهوەتی) نامێنێ و تووشی داوێن پیسی دەبێت.

**٦. كاریگەری مەی لەسەر بێ هێزی لاشە بەرامبەر نەخۆشیەكان:** لاشەی مەی خۆر بەرگری زۆر بێ هێز دەبێت بەرامبەر نەخۆشیەكان و توانای بەرگری بەرامبەر ڤایرۆسەكانی نامێنێ.

**٧. كاریگەری مەی لەسەر منداڵ:** دكتۆر ئەحمەد شەوكەت شەتی دەڵێت: مەی كاریگەری لەسەر منداڵ دروست دەكات بەهۆی دایك و باوكیەوە، لە ڕێی ئەوانەوە

نەخۆشی و بێ هێزییەکان دەگوازرێنــەوە بــۆ منداڵەکــە و منداڵەکــە تووشــی ئــەو نەخۆشیانە دەبێت، کە دایك و باوکی مەی خۆر تووشی دەبێت[1].

### زەرەر و زیانی مەی لە لایەنی کۆمەڵایەتی:

مەی بەلاَیەکەو کۆمەڵگا وێران دەکات، ئەمڕۆ مەی لە وڵاتە ئەوروپییــەکان گەورەترین بەلاَیە ناتوانن چارەسەری بکەن، چــەندین زەرەرو زیــانی هەیــە لــە نــاو کۆمەڵگا لەوانە:

١. تێکدانی شیرازەی خێزان و لێك جیابوونــەی ژن و مێــرد، بــە پلــەی یەکــەم دەژمێردرێت لە تێکدانی کۆمەڵگا.

٢. ڕوداوی ئۆتۆمبێل بە هۆی مەیەوە کوشتنی چەندین کەسی لێکەوتۆتەوە.

٣. کوشتن و بڕین و توندوتیژی لە ناو ئەو کۆمەڵگایانەی کە مەی یــەکجار زۆر تەشەنەی کردووە.

٤. دەبێتە هۆی تێکدانی باری ئاسایشی وڵات، کەس لە خۆی دڵنیاو ئاســوودە نییە، چونکە مەی خۆر عەقڵی لە دەست دەدات، هەموو کارێك ئەنجام دەدات.

٥. زۆر لەو زینایانەی لە نێوان برا و خوشك، یان کوڕ و دایك، یان بــاوك و کــچ ڕوودەدەن، بەهۆی مەی خواردنەوەیە شەو بە سەرخۆشی دێتــەوەو ئــەم کــارە ئــەنجام دەدات، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: ((لاتشرب الخمر فانها مفتاح كـل شـر))[2] واتە: مەی مەخۆنەوە چونکە مەی خواردنەوە کلیلی هەموو شەڕێکە.

---

[1]. نظرات فی المسکرات

[2]. رواه ابن ماجه

**زەرەر و زیانی مەی خۆر لە لایەنی ئیمانی:**

زانایان (١٠) کردەوەی مەی خۆریان ژماردووە کە زەمکراوە و زەرەری ئیمان لە مەی خۆرەکە دەدات.

١. مەی خۆر وەك شێتی لێ دێت کردەوەی نا شەرعی ئـەنجام دەدات، وەك لـە (ابـن ابـي الـدنيا ) داهـاتووە دەڵـێ: مـەیخۆرێکم بینـی لـە بەغـدا میـزی دەکـرد وبەجلوبـەرگی خـۆی دەیسـڕیەوە دەیگـوت: (اللـهم اجعلنـی مـن التـوابین و مـن المتطهرين). واتە: ئەی خودایە لە تۆبەکاران و لە پاکەکارانم بگێڕە.

٢. مەیخۆر بێ عـەقل دەبێت و ماڵ بەفیڕۆ دەدات، ئەمـەش بـێ شـەرعیە وەك ئیمامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەیفەرموو: خودایە شتێکمان لە بارەی مـەی بۆ دابەزێنە چونکە مەی ماڵ لە ناودەبات و عەقڵ تێك دەدات.

٣. مەی خواردنەوە دەبێتە هۆی دوژمنایەتی لە نێوان برا و هاوڕێ و خـەڵکی، وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّمَا يُرِيـدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ ﴾ (المائدة:٩١) واتە: (بەڕاستی شەیتان هەر دەیـەوێت لـە ڕێگـەی عەرەق و قومارەوە دوژمنایەتی و ڕق و کینە بخاتە نێوانتانەوە).

٤. خواردنەوەی مەی مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە پەرستنی خودا و نوێـژکردن، وەك خـــودای گـەورە دەفـــەرمووێت: ﴿ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾ (المائـدة:٩١) واتە: (لەیادکردنی خودا و ناوە پیرۆزەکانی ویڵتـان بکـات، هـەروەها سست و تەمبەڵتان بکات لە ئەنجامدانی نوێژەکان بەشێنەیی، ئایا ئیتر بەس نییە؟ ئایا کۆڵنادەن)؟ (جا هەر کە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە، جاڕدرا بـەناو شـاری

مەدینەدا کە عەرەق حەرام کراوە، ئەوسا باوەڕداران قەڕابە و گۆزە و دیزە و هەرچی عەرەقی تیادا بوو ڕشتیانە کۆلاّن).

٥. مەی خواردنەوە تووشی زینات دەکات کە گەورەترین تاوانە.

٦. مەی خواردنەوە دەرگا و کلیلی شەڕخوازی و گوناهەکانە.

٧. مەیخۆر بەردەوام بۆنی ناخۆشی لیّ دیّت، دەبێتە هۆی ئازاردانی فریشتەکانی سەرشانی.

٨. مەیخۆر (٨٠) جەلدە لەسەر خۆی (واجب) دەکات، ئەگەر لە دونیاش لێی نەدرێت ئەوا لە ڕۆژی دوایی بە شورکی ئاگری جەهەنەم لێی دەدرێت.

٩. مەیخۆر دەرگای ئاسمان لەسەر خۆی دادەخات، بۆ ماوەی (٤٠) ڕۆژ چاکەی بەسەر ناکەویّ و نزای قبولّ نابێت.

١٠. مەیخۆر ئیمانی خۆی دەخاتە قۆناغێکی ترسناك ئەگەر لەسەر مەی خواردنەوە بمریّ، ئیمان نابات لەگەلّ خۆی، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: ((ولایشرب الخمر حین یشربها وهو مؤمن)) واتە: هیچ کەسێك مەی ناخواتەوە ئیلا لەکاتی مەی خواردنەوە ئیمان جێیدەهێلّت. ئەمانە چەند سزایەکی دونیایی بوون کە توشی مەی خۆر دەبیّ، سزاکانی ڕۆژی دوایش یەکجار زۆرن.

## چۆن چارەسەری مەی خواردنەوە دەکرێت:

مەی خواردنەوە گرفتێکی زۆری بۆ کۆمەلّگای ئەمریکی و ئەوڕوپی دروست کردووە، (دائیرەی معارف) لە زانکۆی کالیفۆرنیا دەلّێت: (ان الخمر یعتبر حالیا القاتل الثانی بعد التدخین فی امریکا فشرب المسکرات هناك مسؤول عن موت

(١٠٠،٠٠٠) شخص سنويا) واتە: مـەی خواردنـەوە لـە ئـەمریكا بۆتـە هۆكـاری دووەم دوای جگەرە كێشان بۆ كوشتنی مرۆڤەكان ساڵانە (١٠٠) هـەزار كـەس بـە هۆی شەرابەوە دەمرن.

وە هەروەها لە سەرچاوەیەكی پزیشكی ناودار (cecill)دا هاتووە ئەو زەرەرە ماددیەی بە هۆی شەرابەوە خەرج دەكرێت گەیشتۆتە (١٣٦) ملیار دۆلار لە یـەك ساڵدا.

هەر لە درێژەی قسەكانی (دائیرەی معارف) دەڵێـت مـەی خواردنـەوە تـەنها نەبۆتە هۆی گرفتەكان لەڕێگا و ماڵەوە، بەڵكو بۆتە هۆی كەمكردنـەوەی داهـاتی بەرهەم هێنانی ئەمریكا كـە سـاڵانە زەرەری بەرهـەمی ئـەمریكی دەگاتـە (٧١) ملیار دۆلار.

گۆڤاری (اللانست) ی بەریتانی دەڵێت سـاڵانە لـە ئینگلتـەرا (٢٠٠) هـەزار كەس دەمرن بەهۆی مەی خواردنەوە. لە وڵاتی بەریتانیا ساڵانە ٢ ملیار جونەیهی ئەستەرلینی بۆ گرفتی مەی خواردن خەرج دەكرێت.

یـەكێك لـە كتێبـەكانی بـەریتانی بـەناوی (safe food) دەڵێـت، نیـوەی تاوانەكانی بەریتانیا ئەوانە دەیكـەن كـە سەرخۆشـن، وە سـێ بەشـی ڕوداوەكـانی ئۆتۆمبێل بـەهۆی مـەی خواردنەوەیـە، وە سـێ بەشـی ئەوانـەی خۆیـان دەكـوژن سەرخۆشن وە پێنج یەكی ئەوانەی دەست درێژی (جنسـی) دەكەنـە سـەر منـداڵان سەرخۆشن.

كەواتە ئەمریكا و ئەوروپا بەگشتی بێزاری خۆیان دەربڕیوە لە مەی، هەوڵی زۆریان داوە تـاوەكو چارەسـەری بكـەن بـۆ نموونـە لـە سـاڵی (١٩٣٠)ز دا وڵاتـە یەكگرتوەكانی ئەمریكا بڕیارێكی دەركرد، پلانێكی دانا بـۆ قەدەغـەكردنی مـەی

خواردنەوە و دروست کردن و هێنان و بردن و فرۆشتن و کڕین و هەموو ئەوانە لە پاشان ئەم فەرمانەی بلاّوکردەوە، لە ڕێگای سینەما و فیلم و تەمسیلی و ڕێگاکانی ڕاگەیاندن و بلاّوکردنەوەی لە کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاردا. دواتر ژمێریاری و لێکۆڵینەوەی وردی زانستی پزیشکی بۆ ئەنجامدا و بە ئەندازەی (٦٥) ملیۆن دۆلاری لەم فەرمانە خەج کرد، سزای نیو ملیۆن کەسی دا بە زیندانی کردن و ملیۆن و نیوێکیشی بە پارە سزادا، بەلاّم بۆی چارەسەر نەکرا، چونکە ڕۆحی ئاینی لەگەڵ نەبوو، ئیسلام توانی تەنها بەووشەی (فاجتنبوە) چارەسەری بکات، ئێستاش تاکە چارەسەر بۆ مەی تەنها گەڕانەوەیە بۆ شەریعەتی پاکی خودا، مێژووناسی بەریتانی (ئارنۆلد تۆینبی) لە کتێبی (محاكمة الحضارة)دا دەڵێت تەنها ڕۆحی ئیسلامی دەتوانێ مرۆڤەکان ڕزگار بکات لە مادده بێ هۆشکەرەکان لە ڕێگای بڕوا هێنان و ئیمانێکی قوڵ. ئەم ئیسلامە توانی ئەمە بەرجەستە بکات کە لە مێژووی مرۆڤایەتی نەی توانیوە ئەمە بکات، وە ئەوەی ئیسلام کردی یاسای دەست کرد نەیتوانی بە زەبری هێزیش ئەمە بکات (ا طباء الغرب يحذرون من شرب الخمر)[1]. واتە: دکتۆرەکانی ڕۆژئاوا هۆشداری دەدەن لە خواردنەوەی مەی.

---

[1]. ئەم باسە لە مقالەیەکی خودی نووسەر وەرگراوە کەلە دەنگی غەریبان بلاّوکرابۆوە.

# گرفتی حەوتەم:
# ماددە بێ هۆشکەرەکان (المخدرات)، هۆکار، چارەسەر

### پێناسەی ماددە بێ هۆشکەرەکان (المخدرات):

ماددەی بێ هۆشکەر (المخدرات) بەوە پێناسە دەکرێت، کە ماددەیەك، دەبێتە هۆی داپۆشینی هەموو ئەندامە هەستەوەرەکانی مرۆڤ و لە کاری دەخات.

**پێناسەی ماددەی بێ هۆشکەر لە فقهی ئیسلامی:** ئایینی ئیسلام تاکە ئایینە لە نێو ئایینە ئاسمانیەکان پێناسەی بۆ داناوە وەك خەتابی دەڵێت: (هو كل شراب يورث الفتور و الخدر وهو مقدمة السكر) واتە: هەموو خواردنەوەیەك کە بێ هۆشی و سڕکردنی تێدابێت ئەوە سەرەتایە بۆ سەرخۆشی.

### پێناسەی زانستی بۆ ماددە بێ هۆشکەرەکان:

لە پێناسەی زانستی دەڵێت: (المخدر مادة كيميائية تسبب النعاس والنوم او غياب الوعي المصحوب بتسكين الالم) واتە: (مادەی بێ هۆشکەر ماددەیەکی کیمیاوییە دەبێتە هۆی بورژان و نوستن یان لەدەست دانی هۆشیاری لەگەڵ شکاندنی ئێش و ئازار).

### جۆرەکانی ماددەی بێ هۆشکەر (المخدرات):

ماددەی بێ هۆشکەر دەبێتە چەند جۆرێك و هەر جۆرێکیش لەوانی تر جیایە:

**جۆری یەکەم:** تلیاکی جۆری (ئەفیون)، لە دارێك دروست دەکرێت بە ناوی (خەشخاش) کە هێشتا نەگەیشتبێ.

ئەم جۆرەیان لە خراپترین جۆری ماددە بێ هۆشکەرەکانە، لە کاتی خواردنی، قوت دەدرێ یان لەگەڵ چای و قاوە و جگەرە و نێرگەلە تێکەڵ دەکرێت، سەرەتا کە کەسەکە دەیخوات توانایەکی باش پەیدادەکات بەڵام بە زووترین کات ئەم توانایە لە دەست دەدات و دەکەوێتە خەوێکی قووڵ. هەر مرۆڤێك تووشی ئەم جۆرەیان بێت بۆ ماوەیەك، دواتر دەبێتە بەشێك لە ژیانی، ناتوانێ بەبێ خواردنی تلیاك هیچ هەنگاوێك بهاوێژێت. چەند جۆرێکی تری هەیە کە پێی دەڵێن (مشتقات) ی وەرگیراو لە تلیاك (ئەفیون) وەك، مۆرفین، هیرۆیین، کۆدایین.

**جۆری دووەم:** (حشیشە)، ئەم جۆرە ماددە بێ هۆشکەرە ناوی زۆرە و گەیشتۆتە (٣٥٠) ناو بۆ هەر شوێنێك ناوێکی لێ نراوە، کە گرنگترین ناوی ئەم ماددەیە حشیشەیە ناوی (تێتراهایدرەکانەبینۆل) ە (T H C).

**جۆری سێ یەم:** هەست جوڵێنەرەکان (المثیرات) یان هۆشیارکەرەو (المنبهات)، ئەم جۆرەیان ئامێرە هەستەوەرەکان ئاگادار دەکاتەوە، هێزێکی زۆری پێ دەدات دەتوانێ بۆ ماوەیەك نەنوێت ئەوانەش کۆمەڵێکن بەم ناوانە (کۆکایین، مفیتامین) ئەم جۆرەیان لە گژوگیا دروست دەکرێت پێش (١٠٠) ساڵ لە چیای ئەندیز لە ئەمریکای باشوور دۆزرایەوە بە ناوی (کۆکا). دکتۆر موحەممەد عەلی ئەلیار دەڵێ، ئەم جۆرەیان زیاتر لە (١٠) ملیۆن کەس لە ئەمریکا بەکاری دەهێنن.

**جۆری چوارەم:** ماددەی بیّ ئاگاکارەکان (المهلوس)، ئەم جۆرە ترسناکترین جۆری ماددە بیّ هۆشبەرەکان ناوی (LSD)یە، زۆرجار دەبێتە هۆی خۆکوشتنی خۆی.

نیشانەکانی ئەو کەسەی کە ماددەی هۆشبەریەکان دەخوات، سەرەتا لە ماڵەوە چۆن دەتوانین نیشانەکانی ئەو کەسە بناسینەوە ئەگەر کەسەکە ماددەی هۆشبەری بەکارهێنا.

١. لە تاکەکانی خێزان دوور دەکەوێتەوە.

٢. نایەوێ چاوی بەدایك و باوکی بکەوێ.

٣. باری سروشتی تێك دەچێت.

٤. لەسەر هەموو شتیّ مشتومڕ دەکات.

٥. بەردەوام یاخی دەبێت.

٦. لە قسەکردن پاراو نییە.

٧. بەسەرهاتی بەدرۆ دەگێڕێتەوە.

٨. هەڵسوکەوتی ناسروشتی و زیادەڕۆی تێدا دەردەکەوێ.

٩. چاوەکانی سور هەڵدەگەڕێ.

١٠. زۆر دەخەوێ یان زۆر بە ئاگایە.

١١. شەوانە درەنگ دەڕوات بۆ دەرەوە.

١٢. لە دەرونەوە زۆر شپرزە دەبێت.

١٣. سەرپێچی یاسا زۆر دەکات.

١٤. هەوڵی خۆکوشتن دەدات.

١٥. بە گومانەوە قسە لەگەڵ بەرامبەر دەکات.

هەڵسوکەوتی لە قوتابخانە:

١. بیروهۆشی بێ هێز دەبێت.

٢. ڕێز لە بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانە ناگرێ.

٣. بەشداری لە ڕۆژانەی وانەکان ناکات.

٤. بەردەوام سەرقاڵی گزیکردن و شت دزینە.

٥. بەردەوام کێشە دەنێتەوە.

٦. زۆر دوادەکەوێ لە ئامادەبوونی قوتابخانە.

٧. پەنا بۆ ئەو شوێنانە دەبات کە جگەرەی لێ دەکێشرێت.

٨. گرفت لەگەڵ مامۆستاکان دروست دەکات[١].

## حوکمی شەرعی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان:

شەریعەتەکانی خودایی و کۆتا شەریعەتیش کە ئیسلامە سورن لەسەر ڕێکخستنی ژیان بە جوانترین شێواز، ئەوەی بەرژەوەندیە بۆ مرۆڤەکان دەستەبەر کراوە ئەوەی زەرەر و زیانی هەیە بۆ مرۆڤ ئەوا شەریعەت قەدەغەی کردووە، سزای

[١]. سودم لەسایتی ئینتەرنێت وەرگرتووە.

بۆ ئەو کەسە داناوە کـە بـەکاری دەهێنـێ. یـەکێك لەوانـەی بـە ئاشـکرا زەرەری کۆمەڵگا و تاکەکانی هەیە ماددە هۆشبەرەکانە، دەبێتـە هـۆی تێکـدانی عـەقڵی مـرۆڤ و ڕێـز و پلـە و پایـەی لـە نـاو کۆمـەڵگا نـامێنێ. پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموویێت: ((لا ضرر ولا ضرار))[1] واتە: زیان بەکەس مەگەیێنن و کاردانـەوەی زیان دانیشتان نەبێت. هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت نهی رسـول الله (ﷺ) ((عن كل مسكر مفتر))[2] واتـە: پێغەمبـەر (ﷺ) هـەموو ماددەیـەکی هۆشبەری قەدەغەکردووە. ئیمامی قەڕافی و ئـیبن تەیمیـە (ئیجمـاعی) زانایانیـان (نەقل کردووە) لە سەر ماددەی هۆشبەر ئیبن تەیمیە دەڵێت: (ومـن اسـتعملها فقـد كفر وانمالم تتكلم فيها الائمه الاربعه رضى الله عنهم لانها لم تكـن فـى زمـنهم وانمـا ظهرت فى اخر المئة السادسة) واتە: هەر کەسێك ماددەی هۆشبەر بەحـەلاڵ دابنـێ کافرە. چوار ئیمامەکە بۆیە قسەیان لەسەر نـەکردووە چـونکە لەسـەردەمی ئـەوان نەبووە لە کۆتایی سەدەی شەشەم پەیـدابووە. هـەروەها ئـیبن تەیمیـە لـە (سیاسـه الشرعیه) دا دەڵێت: (ان الحشيشة حرام يُحَد متناولها كما يحد شـارب الخمـر) واتـە: حشیشە حەرامە هەر کەسێك بەکاری بهێنێ (حەدی) لێ دەردەکرێت وەك مەیخۆر.

ئیمامی سەنعانی لە(سبل السلام) دا دەفەرموێت: (انه يحرم مـا اسـكر مـن اى شئ وان لم يكن مشروباً كالحشيشة) واتە: هەر شتێك سەرخۆشت بکات حەرامـە با شەرابیش نەبێ وەك حەشیشە. هـەروەها ئـیبن ئـەلقیم لـە (زاد المعـاد) و ئـیبن حەجەر **و** ئیبن بەیتار هەموویان یەك دەنگن لەسەر حەرامی ماددەی هۆشبەر[3].

[1]. رواه ابن ماجة

[2]. رواه احمد

[3] سەیری فقه الاسلامی ج٧ ص ٥٥١٦ بکە

## سزای ئەم تاوانە:

کۆمەڵی زانایان لەسەر ئەوەن کە دەبێ وەك مەیخۆر ئەگەر بەبێ (عوزر) بەکاری هێنا (حەدی) لێ دەربکرێ. وەك لە پێشدا هێنامانەوە کە ئیبن تەیمیە دەفەرمووێت: (اقامة حد الخمر علی من سکر من الحشیشة). واتە: بەرپاکردنی (حەدی) مەیخۆر لەسەر کەسێکە کە بە حشیشە خۆی سەر خۆش بکات. هەروەها بەکارهێنان و فرۆشتن و کڕین و بارکردن و سوود لێ وەرگرتن و بازرگانی پێ کردن، هەموو زانایان دەفەرموون حەرامە. هەندێك لە زانایان سزای کوشتنیان داناوە بۆ ئەو کەسەی ماددە هۆشبەرەکان بەکاردەهێنێ، چونکە دەبێتە هۆی تێکدانی کۆمەڵگا و شڵەژانی ئاسایشی دەوڵەت.

## زەرەر و زیانەکانی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان:

زەرەر و زیانەکانی ماددە هۆشبەرەکان بۆ تاك و خێزان و کۆمەڵگا و ڕەوشتی گشتی و تێکدانی باری ئاسایشی وڵات و گیانی سیاسی و ئابووری و بەرژەوەندی گشتی یەکجار زۆرە. بەکورتی هەندێکیان دەخەینە ڕوو.

## زەرەر و زیانی بۆ تاکە کەس:

١. دەم و چاوی زەرد و ڕەش هەڵدەگەڕێت و ئارەزوی خواردن ناکات و بێ هێز دەبێت، بەرگری نەخۆشی نامێنێت چاوی سور هەڵدەگەڕێت.

٢. سینگی تووشی هەوکردنێکی بەردەوام دەبێ سەرئەنجام دەمارەکانی تووشی نەخۆشی ترسناك دەبن.

٣. هەرسکردنی خواردنی نامێنێت و غازاتی زۆر دەبێت و تووشی سکچوونی بەردەوام دەبێت، کۆئەندامی هەرسی تووشی هەوکردن دەبێت.

٤. جگەری ئەستور دەبێت و خانەکانی دەمرن و ماددەی شەکرەی زیاد دەبێت.

٥. مێشکی تووشی هەوکردن دەبێت و ملیۆنەها خانەی لێ دەمرێت و دەبێتە هۆی کەم بیرکردنەوە و بێ هێزی بینین و بیستن.

٦. تووشی نەخۆشیەکانی دڵ دەبێت و پاڵەپەستۆی خوێنی زیاد دەکات و خوێنبەرەکان تەسك دەبنەوە.

٧. کردەوەی زایەندی(جنسی) بێ هێز دەبێت و چالاکی نامێنێ.

٨. کاریگەری لەسەر منداڵی تازە بوو پەیدادەکات. وەك نەخۆشی شەکرە و هەوکردنی جگەر و هەوکردنی دەمارەکانی.

٩. هەروەها لەو کەسانەی زۆر ماددەی هۆشبەرەکان بەکاردەهێنن تووشی جۆرەها نەخۆشی شێرپەنجە دەبن.

١٠. ئەگەر زیاد بەکاری بهێنێ دەبێتە هۆی جەڵتەی خوێن یان دەماغ و یان دڵ و دەمرێ[١].

**زەرەرو زیانی دەرونی بەم جۆرەیە:**

١. کاریگەری لەسەر هەستەوەرەکان دروست دەکات بەتایبەتی بینین و بیستنی دەگۆڕێت و شت وەکو خۆی نابینێ و نابیستێ.

٢. هەندێك هەڵسوکەوتی نارێك و نامۆ ئەنجام دەدات و بیرکردنەوەی زۆر لە سەرخۆ و لاواز دەبێت.

٣. دوودڵی و پەشۆکاوی و نائارامی دەیگرێت و تووشی هەڵچوون و داچوون دەبێت و توانای کارکردنی نامێنێت و ناتوانێ ماوەیەك بڕوات.

---

[١]. (اضرار المخدرات و اثارها على الفرد و المجتمع) بقلم محمد محمود

٤. سەرەتا تووشی جیهانێکی خەیاڵی دەبێت و دەکەوێتە بیرکردنەوەیەکی خۆش و لە جیهانێکی تردا دەژی کە کاریگەری نەما، دەست بەجێ تووشی دڵ توندی و نائارامی و پەشیمانی دەبێت.

## زەرەر و زیانی باری ئاسایش:

باری ئاسایشی وڵات بەهۆی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان تێك دەچێت، زۆر لە کارمەندان بەکاری دەهێنن و ناتوانن بەکاری ئاسایی خۆیان هەڵسن. بۆیە ئەوانەی کاری بازرگانی بە ماددەی هۆشبەر دەکەن دەست لەگەڵ هەندێك کاربەدەست تێکەڵ دەکەن بۆ ئەوەی ڕێگایان بدەن ماددەی هۆشبەر بهێنین بۆ ناو وڵات سەرئەنجام باری ئاسایش تێك دەچێت.

## زەرەر و زیانی باری ئابووری:

ماددەی هۆشبەرەکان زەرەر و زیانی زۆر لە باری ئابووری تاك بەتایبەتی و وڵات بەگشتی دەدات.

١. تاك ئابووری خۆی زۆر لەم ڕێگایە خەرج دەکات، هیچ سەرمایەیەکی بەدەستەوە نامێنێ.

٢. ئەم ماڵەی خەرجی دەکات هیچ شوێنێك ناگرێت.

٣. هۆکارێکی سەرەکی یە بۆ هەژاری و ماڵوێران کردن.

٤. وڵات پارەیەکی زۆر بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە لە ڕێی نەخۆشخانەو بەندیخانە و نەهێشتنی تاوان و دەزگای چاکسازی خەرج دەکات.

**زەرەر و زیانی ئایینی:**

١. وازهێنان لە نوێژ و زیکری خودا کە پایەی ئیسلامە.

٢. ئیمانی بێ هێز و لاواز دەکات و پەشیمانی دای دەگرێ.

٣. شەرمی نامێنێ کە بەشێکە لە ئیمان.

٤. دەرگای تاوانە گەورەکان دەبێتەوە.

٥. هۆکارە بۆ نەمانی نیعمەتی خودا و دابەزینی تورەیی خودا.

٦. کردەوەیەکی پیسە، کردەوەی شەیتانە.

**زەرەر و زیانی بۆ سەر خێزان:**

خێزان بەشێکی گرنگی کۆمەڵگایە ئەگەر چاك بوو کۆمەڵگاش چاك دەبێت، وە ئەگەر خراپ بوو کۆمەڵگاش خراپ دەبێت. ماددەی هۆشبەر لە چەند لایەکەوە خێزان لێك هەڵدەتەکێنێ و لەناوی دەبات.

١. ئەو منداڵەی لە دایك و باوکی بێ هۆش لە دایك بێت کۆمەڵێك نەخۆشی هەڵگرتووە و ناتەواوە.

٢. ئەو پارە زۆرەی باوك لە مادە هۆشبەرەكان خەرجی دەكات، خێـزان دەخاتـە هەژاریەوە و ئاستی بژێوی ژیان دادەبەزێنێ و ناتوانێ خۆی پێ بگەیەنێ.

٣. ڕاستەوخۆ منداڵ لـە دوای بـاوكی فێـری بـەكارهێنانی مـاددەی هۆشـبەر دەبێت.

٤. بێ ڕێزی لە نێوان تاكەكانی خێزان، بە جۆرێك یـەكتری كوشـتن و بڕینـی لێ دەكەوێتەوە.

**زەرەر و زیانی لە سەر بەرهەمی وڵات:**

١. هەر وڵاتێك بازرگانی ماددەی هۆشبەری تێدابێت چاودێری زۆری دەوێت بۆ قـایم كردنـی سـنورەكان و چـاودێری نەخۆشـخانە و بەندیخانـە و دادگاكردنیـان و ڕەچاوكردنی هەموو بارەكانی پەیوەندیان بەم كارە هەیە، ئەگەر مـاددەی هۆشـبەر لە وڵات نەبێ ئەو هەموو چاودێر و خەرجی یە لە بوارێكی تر خەرج دەكرێت وڵات پێش دەكەوێت.

٢. ئەو بودجە و پارەیەی لە ماددەی هۆشبەر خەرج دەكرێت زەرەر و زیانی زۆر لە داهاتی وڵات دەدات شوێنی هیچ ناگرێ.

٣. زۆربەی ئەو كەسانەی ماددەی هۆشبەر بەكاردەهێنن تووشی بێكاری دەبـن، ئەوەش بەرهەم و داهاتی وڵات كەم دەكاتەوە.

٤. هەر كۆمەڵگایەك ماددەی هۆشبەر بەكاربهێنێ گەشـەپێدانی مرۆڤـی تێـدا كەم دەبێتەوەو بەرەو نەمان دەچێت، ئەوەش دەبێتە هۆی دواكەوتنی شارسـتانیەتی وڵات.

٥. هەر حکومەتێك بیەوێ باری ئابووری ولاّت پێش بخات دەبێت ووزەی ناو کۆمەڵگا بەهێز بکات بۆ ململانێی شارستانی، تاکی کۆمەڵگا ئەگەر ماددەی هۆشبەر بەکاربهێنێ عەقڵ و ژیری و هۆشیاری لە دەست دەدات، ناتوانێ ململانێی شارستانی بکات.

٦. هۆکاری سەرەکی بۆ پێشکەوتنی باری ئابووری وولاّت ئاسایشە، هەر کۆمەڵگایەك ماددەی هۆشبەر بەکاربهێنێ ئاسایشی تێکدەچێت و تاکەکان خەریکی هۆسە و ڕاوەدونان و بەندیخانە و نەخۆشخانەکان دەبن، جا ئابووری ولاّت چۆن پێش دەکەوێت[1]؟

**چۆن منداڵەکەت دەپارێزی لە ماددەی هۆشبەر:**

١. گومان لەوە دانییە کە باشترین هۆکار بۆ پاراستنی منداڵ لە ماددەی هۆشبەر، پەروەردەکردنە هەر لە منداڵیەوە لەسەر پەروەردەیەکی ڕێك وپێکی ئایینی. ئەمەبکە بەبەشێك لەژیانی ڕۆژانەت.

٢. هەوڵبدە هاوڕێی باشی بۆ پەیدابکە و دووری بخەوە لە هاوڕێی خراپ.

٣. کاتێك منداڵەکەت گەیشتە تەمەنی (١٠) ساڵ بەرەو ژوور بەتەواوی باسی خراپەکانی ماددەی هۆشبەری بۆ بکە و لە زەرەرو زیانی ئاگاداری بکەوە.

٤. مەهێلە تووشی جگەرەکێشان و مەی خواردنەوە بێت، چونکە زۆربەی ئەو کەسانەی ماددەی هۆشبەر بەکاردەهێنن جگەرەکێش و مەیخۆرن.

٥. بۆ منداڵەکەت ببە بە پێشەنگێکی چاك و جگەرە و مەی مەخۆرەوە، با

[1]. سودی زۆرم لە کتێبی (اضرار المخدرات و اثارها)ی (محمد محمود) وەرگرتووە.

منداڵـەکانت چـاوت لـێ نەکـەن. ((اجتنبـوا الخمـر فانهـا ام الخبائـث))[1]. واتـە: دوورکەونەوە لە مەی چونکە مەی دایکی هەموو پیسیەکانە.

٦. هانی منداڵەکەت بدە لەکاتی بێکاری با بە وەرزش و یاری حـەڵاڵ خـەریك بێت.

٧. هانی منداڵەکەت بدە بۆ لەبەرکردنی قورئان.

٨. چاودێری بەردەوامی منداڵەکەت بکە، بزانە ڕۆژانە لەگـەڵ کـێ دەگـەڕێت، لەکوێ دادەنیشێت، بۆ کوێ دەڕوات، بەچی خەریکە.

٩. منداڵەکەت بەتەنیا بەجێ مەهێڵە.

١٠. چـاودێری هەڵسـوکەوتی بکـە، ئەگـەر نیشـانەیەکی لێ بەدەرکـەوت زوو چارەسەری بکە بەهەر شێوازێك بێت.

## چۆنیەتی چارەسەری گرفتی ماددەی هۆشبەر:

### چارەسەری ئایینی:

ئیسلام گرفتی مـەی کردۆتـە هۆکـارێکی سـەرەکی بـۆ بنبڕکردنـی مـاددە هۆشبەرەکان، ماددەی هۆشبەر لە مـەی خواردنـەوەوە سەرچـاوە دەگـرێ، خـودای گەورە بە دوو ڕێگا چارەسەری مەی کردووە.

**یەکـەم:** بــە هــەموو شــێوەیەك مــەی خواردنــەوەی حــەرام کــردووە، وەك

---

[1]. النسائی

دەفـــەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ (المائـدة:٩٠) واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دڵنیـابن کە عەرەق و قومارو گۆشتی مالاَتی سەربڕاو بۆ غەیری خودا لـەو شـوێنانەی کـە خەڵك بەپیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج حەرام و حـەلاَڵ زانـین بـەهۆی هەڵـدانی زارەوە ئەمانە هەر پیسن و لەکاروکردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێـوەش خۆتـانی لـێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپـارێزن، بـۆ ئـەوەی سـەرفرازی و بەختـەوەری بەدەسـت بهێنن (لەهەردوو جیهاندا) ).

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((کل مسکر خمر، و کـل خمـر حـرام و مـن شرب الخمر فی الدنیا فمات وهـو یـدمنها لم یتـب لم یشـربها فـی الاخـره))[1] واتـە: هەموو سەرخۆشکەرێك شـەرابە وە هـەموو شـەرابێکیش حەرامـە هـەر کەسـێك شەرابی سەرخۆشکەر لە دونیادا بخواتەوەو لێی بـەردەوام بێـت و لەسـەری بمرێـت، شەرابی بەهەشت ناخواتەوە.

**دووەم:** دانانی سزای توند بـۆ کەسـی مـەیخۆر (حـەد لـێ دەرکردنـی) ڕێگـای دووەمە بۆ کۆتایی هێنان بەم کارە. لە ئەنەسەو دەفەمووێت (أن النبی (ﷺ) جلـد فی الخمر بالجرید والنعال ثم جلد ابوبکر اربعین، فلما کان عمر قال ماترون فـی جلـد الخمـر. فقـال عبـدالرحمان بـن عـوف اخـف الحدود ثمـانون فـأمر بـه عمـر)[2] واتـە: پێغەمبەر (ﷺ) جەلدی لـە شـەراب خـۆر داوە بـە شـورکی دار و نەعلـە، دوای ابوبکر کردی بە (٤٠) جەلدە، کاتێـك عومـەر هـات پرسـیاری لـە بـارەی سـزای شەراب کرد عەبدولڕحمان فەرمووی (٨٠) جەلدە عومەر بە مە فەرمانی کرد.

---

[1]. رواه مسلم

[2]. رواه مسلم

**سێیەم:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێت: هەموو سەرخۆشکەرێك قەدەغەیە کەواتە ئەمەش ڕێگایەکە بۆ چارەسەرکردن.

تێبینی، چارەسەری مادده هۆشبەرەکان دەکرێت لەڕێی دکتۆرەوە بە تایبەتی دکتۆری دەرونی ئەویش بە چەند ڕێگایەك.

## گرفتی هەشتەم:
## جگەرەکێشان، هۆکار، چارەسەر

یەکێك لە گرفتەکانی ئەمڕۆی گەنجان، جگەرەکێشانە کە بۆتە دیاردەیەکی زۆر بلاّو لە ناو کۆمەڵگادا، بەشێکی زۆر لە چین و توێژەکانی کۆمەڵگا لەپیاوان و ئافرەتان و گەنجان و منداڵیش خەریکی جگەرە کێشانن، بۆیە پێویست دەکات تیشك بخەینە سەر هۆکارو حوکمی شەرعی و زەرەرو زیانەکانی ئەم گرفتە.

**هۆکاری جگەرەکێشان:**

چەند هۆکارێك هەن بۆ ئەوەی گەنج تووشی جگەرەکێشان بێت لەوانە:

١. بێکاری، بێکاری گەنجان هۆیەکە بۆ جگەرەکێشان، بۆیە گەنجان پێیان وایە ئەم بۆشاییە بە جگەرەکێشان پڕدەبێتەوە.

٢. چاولێکردن، کاتێك باوك یان دایك لە ماڵەوە جگەرە دەکێشێ، ئەوەی دوای ئەو پێیوایە کارێکی باشە و چاوی لێدەکات و دەبێتە جگەرەکێش.

٣. چاودێری نەکردنی منداڵ لە لایەن باوك ودایکانەوە بەتایبەتی لەتەمەنی منداڵی.

٥. گرفتی خێزانی، گرفتی نێوان دایك و باوك و تەلاّقدان و شەر و ناخۆشی لە ناو خێزان هۆکارە بۆ تووش بوونی منداڵ بە جگەرەکێشان.

٥. لە کاتی تووش بوونی گرفتێك، زۆر کەس پێی وایە جگەرەکێشان خەم

لادەبات و کەمی دەکاتەوە لە کاتی تووش بوون بە گرفتێك دەست بەجێ پـەنا بـۆ جگەرەکێشان دەبات.

٦. دۆست و هاوڕێی خراپ و جگەرەکێش.

٧. ماددەی سڕکەر، جگـەرە ماددەیـەکی تێدایـە پێـی دەڵـێن نیکـۆتین، ئـەم ماددەیە لە ماددەی سڕکەر دەچێت و لەگەڵ خوێن تێکەڵ دەبێت و ڕۆژانـە هـۆگری دەبێت.

## زەرەر و زیانەکانی جگەرە کێشان:

زۆر لە ڕاپۆرتە پزیشکی یەکان زەرەرو زیانی جگەرەکێشانیان ڕوون کردۆتەوە:

١. سەرەتا سەرپێچی کردنی خودای گەورەیە و خاوەنەکەی تووشی سزا دەبێت.

٢. ئەوەی جگەرەکێشە بـۆنی لـێ دێ، بـۆنی ناخۆشـیش فریشـتە بـەڕێزەکانی سەرشانی ئازار دەچێژن.

٣. ئازاری موسوڵمانان دەدات بە بۆنی دوکەڵی ناخۆش.

٤. کەش و هەوای پاك، پیس دەکات.

٥. نەخۆشیەکە دەگوازرێتەوە بۆ مندالّەکانی.

٦. خەرجکردنێکی بێ سـودە، خـودای گـەورە ئـەو کەسـانەی خۆشـناوێ وەك دەفەرموێت: (ولا تسرفوا انه لایحب المسرفین). واتە: زیاد لە پێویست خەرج مەکـەن چونکە خودای گەورە زیادەڕۆکارانی خۆش ناوێت.

٧. تاوانێکی ئاشکرایە و هـەموو خـەڵك ئاگـادارە، تـاوانی ئاشـکراش سـزای توندە.

٨. لێدانی دڵ زیاد دەکات.

٩. هەستی بۆنکردن و تامکردن بێ هێز دەکات.

١٠. لاشە بەگشتی بێ هێز دەبێت.

١١. هۆیەکە بۆ تووش بوون بە شێرپەنجەی سی یەکان و هەوکردنێکی بەردەوام.

١٢. هۆیەکە بۆ تووش بوون بە شێرپەنجەی قوڕگ.

١٣. هۆیەکە بۆ تووش بوون بە شێرپەنجەی لێوو زمان ودەم و پەنکریاس.

١٤. ئەو کەسەی جگەرەکێشە دەبێتە پێشەنگێکی خراپ بۆ منداڵەکانی.

١٥. جگەرەکێش لەشی زۆر گرانە بۆ خودا پەرستی.

١٦. زۆر کەس بەهۆی جگەرەکێشان ناتوانێ لە مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژووبێ.

١٧. بیروهۆشی بێ هێز دەبێت و زوو شتی بیردەچێت.

١٨. هۆیەکە بۆ تووش بوون بە نەخۆشی (قورعە معدە) و دوانزەگرێ.

١٩. ماڵێکی زۆری پێ بە فیڕۆدەچێ، لە ڕۆژی دوایی لە سەری سزا دەدرێت، کاتێك پرسیاری لێ دەکرێت (عن مالھن این اکتسبە و فیم انفقە). واتە: لە ماڵەکەی لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، چۆنی پەیداکردووە و لەچی خەرج کردووە.

٢٠. سەرئەنجام بەشێکی زۆر لەنێو دەچن و دەمرن، لە ڕاپۆرتی دکتۆرەکانی زانکۆی شاهانەی لەندەندا هاتووە جگەرەکێش لە چەرخی نوێ بۆتە هۆکار بۆ لەناوبردنی کەسانێکی زۆر کە لەپێشدا هیچ دەردێکی کوشندە ئەوەندەی نەکوشتووە هەروەها دەڵێت، ڕێژەی (٩٥٪) ئەوانەی تووشی نەخۆشی خوێنبەرەکان دەبن بە هۆکاری جگەرەکێشانە.

**سەرئەنجام:**

ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ڕایگەیاند لە ساڵی (٢٠٢٠) ڕێژەی مردووان لە جیهان بە هۆی جگەرەکێشان دەگاتە (١٠) ملیۆن کەس لە یەك ساڵ دا، (٧) ملیۆنیان لە جیهانی سێیەمن، وە ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوو لە زیادبوونە، هەروەها لە ڕۆژی جیهانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەهێشتنی جگەرەکێشان ڕاپۆرتێك پێشکەش کرا کە ژمارەی ئەو کەسانەی جگەرە دەکێشن لە جیهان گەیشتۆتە ملیاریك و سەد ملیۆن کەس. ئەم ڕاپۆرتە ئاماژە بەوە دەکات ئەوانەی تەمەنیان لە (٣٥) ساڵ بۆ (٦٩) ساڵە سێ بەقەد ئەو کەسانە دەمرن کە جگەرەکێش نین.

**حوکمی شەرعی جگەرە کێشان:**

جگەرە شتێکی تازەیە لە سەدەی دەیەمی کۆچی پەیدابووە، دواتر وای لێهات بەبلاوی لەناو خەڵك بەکاربهێنرێت، زانایان بە چەند شێوازێك باسی حوکمی جگەرەکێشانیان کردووە. هەندێك بۆچوونیان وایە، دەڵێن چۆن شتێك حەرام بکەین کە دەقێکی شەرعی لەسەر نییە؟ دیارە پێویست نییە هەموو حەرامێك دەقێکی تایبەتی لەسەر بێت بەڵکو چەند (قاعیدە) و (زەوابیتێکمان) هەن گشتی یەو ئەوانە دەچنە ژێری، ئەوەندە بەسە کە شەرع شتی پیس و زیانبەخشی حەرام کردووە بۆ ئەوەی هەر شتێك لە خواردن و خواردنەوەیەکی پیس نەچێتە ژێر ئەم (قاعیدە). دیارە کۆمەڵێ زانایان (ئیجماعیان) لەسەر حەرامی حەشیشەو (مخدرات) بڕیارداوە کەچی دەقێکی تایبەتی لە سەر نییە. زانایان بەم بەڵگانەی خوارەوە دەڵێن جگەرە حەرامە:

١ . شتێکی زیانبەخشە و شەرع (نەهی) لە شتی زیانبەخش کردووە وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لا ضرر ولا ضرار)). واتە: زیان بەکەس مەگەیێنن و کاردانەوەی زیان دانیشتان نەبێت.

٢. بە ڕاپۆرتی سەرجەم پزیشکان جگەرە زیان بە لەشی مرۆڤ دەگەیەنێ و دەبێتە هۆی کوشتنی، خودای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ﴾ (النساء:٢٩) واتە: خۆتان مەکوژن یان خۆتان مەفەوتێنن بەتاوان. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾ (البقرة:١٩٥). واتە: بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە.

٣. زەرەرو زیانی ماڵی، جگەرەکێشان زەرەرێکی ماڵی زۆر لە خاوەنەکەی دەدات بەبێ سوود گەیاندن، کەواتە خەرجکردنی ماڵە بەبێ هودە ئەمەش خودای گەورە نەهی لێ کردووە وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ (الأنعام:١٤١)، واتە: زیادەڕەوی مەکەن و بێگومان خودا زیادەڕەوانی خۆش ناوێت. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا ٢٦ إِنَّ ٱلۡمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخۡوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾ (الإسراء:٢٦-٢٧) واتە: زیادەڕەویش مەکەن بەڕاستی زیادەڕەوان دۆست و برای شەیتانەکانن.

٤. زانایانی (ئوصولی و فوقەهای دین) پاراستنی پێنج پێویستیەکان وەك پاراستنی ئایین و دەرون و عەقڵ و وەچە و ماڵ. جگەرەکێشان ماڵ بەفیڕۆ دەدات،

کاریگەری لەسەر عەقڵ دروست دەکات، نەخۆشی بۆ وەچەش دەگوازێتەوە و زۆرجار ڕۆژو ناگرێ لەبەر جگەرەکێشان کەواتە زیانبەخشە بۆ ئایینیش.

٥. جگەرە بە هەموو شێوەیەك دەچێتە باری پیسی، تاك و کۆمەڵگاو ژینگەش پیس دەکات کەواتە پاك نییە، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴾ (الأعراف:١٥٧) واتە: شتە خاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات و شتە پیسەکانیان لێ قەدەغە دەکات.

٦. زانایانی سەردەم دوای ئەوەی زەرەری جگەرە لەلایەن پزیشکەکانەوە ڕاگەێنرا بەشی هەرە زۆری حەرامیان کردووە وەك، ( شێخ عەبدوڵلا بن باز- موحەممەد بن سالح عوثەیمین – ئەحمەد شرباسی – د.یوسف قەرزاوی – شێخ شەر نەبلالی – سالم سنهوری – قلیوبی – شێخ ئەحمەد بەهوتی). لەگەڵ بەشێکی زۆری تر لە زانایان.

هەروەها لە کتێبی (فقه الاسلامی وادلته) ١٣ بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر حەرامی جگەرە کێشان.

تێبینی، ئەم بەڵگانەم لەم سەر چاوانە وەرگرتوە.

١. فتاوی علماء البلد الحرام.

٢. جامع الفتاوی الطبیه و الاحکام المتعلقه بها.

٣. فقه الاسلامی و ادلته.

٤. موسوعه الاعجاز العلمی من القران والسنه.

٥. مقالەیەکی شێخ قرزاوی لەسەر جگەرە.

**چۆنیەتی خۆپاراستن لە جگەرەکێشان:**

**چەند ئامۆژگایەك بۆ وازهێنان:**

١. ڕێنوێنی و ئامۆژگاری خەڵك بکرێت لە ڕێگای زانایانی ئاینی و لە حوکمی شەرعی ئەم گرفتە ئاگادار بکرێنەوە.

٢. باوك و دایك پێشەنگی چاك بن بۆ منداڵەکان و لەبەرچاویان جگەرە نەکێشن.

٣. کاتێك تووشی گرفتێك بووی لە جیاتی جگەرەکێشان، لەلای کەسێکی نزیکی خۆت چارەسەری بکە.

٤. گرنگی بە وەرزش بدە بۆ ئەوەی لاشەت بەهێز بێت و توانای خۆگرتنت هەبێ.

٥. کاتی بێکاری بەشتێکی بەسوود پڕبکەرەوە وەك کتێب خوێندنەوە و نوسین و شتی تر.

٦. ئەو لێکۆڵینەوانە بخوێنەوە کە باسی زەرەرو زیانی جگەرە دەکەن لە ڕووی تەندروستی و کۆمەلایەتی و ماڵی.

٧. خۆت بە دوور بگرە لەو شوێنانەی جگەرەی لێ دەکێشرێت.

٨. سەرەتا کە وازت لێ هێنا کەم کەم وازی لێ بهێنە، هەر ڕۆژەو هەندێك کەمی بکەوە.

٩. ئەو کاتەی دڵت بۆ جگەرە چوو چایەك یان قاوە یان شەربەت بخۆرەوە.

١٠. بیر لە لاشەی خۆت و ئەو پارەیەی خەرجی دەکەیت بکەوە کە بێ سوود خەرجی دەکەیت، ئەگەر لە هەر شتێکی تر خەرجی بکەیت سوودی زۆرت پێ دەگەیێنێت.

١١. پشت بەخودا ببەستەو بڕیاری تەواو بدە.

١٢. لە بڕیاردانت ڕاستگۆبە و دەوروبەری خۆت ئاگاداربکەوە کە وازت لە جگەرە هێناوە.

١٣. بیر لەو ڕۆژە بکەوەو تەماشای هەناسەی بەسالاچوێکی جگەرەکێش بکەو خۆت بهێنە بەرچاو کە ئەم ڕۆژگارە چاوەڕێت دەکات.

١٤. لاشەیەکی پاك، پیس مەکە بە بۆنێکی ناخۆش، پارەیەکی نرخدار بێ سوود بەفیڕۆ مەدە، ژینگەیەکی پاك لێڵ مەکە.

# گرفتی نۆیەم:
# خراپ بەکارهێنانی مۆبایل، هۆکار، چارەسەر

ئەگەر نیعمەتەکانی مۆبایل بژمێرین نایەتـە ژمـار، ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾ (النحل:١٨) واتە: ئەگەر نیعمەتی خودا بـژمێرن بۆتـان ناژمێردرێـت. یەکێك لەم نیعمەتانە مۆبایلە، بۆتـە هۆکـارێکی زۆر بەسـود بـۆ ژیـان تـاوای لیٚ هاتووە کەس بەبێ مۆبایل نەتوانێ. لەهەموو بوارەکانی ژیان سودی لێ وەردەگیرێ ڕێگای کورت کردۆتەوە، کاتی زۆر کـەمی دەوێـت، سـودی ئەوەنـدە زۆرە نایەتـە ژمار. دیارە گومان لەوەدانیـە زۆربـەی شـتەکان لایـەنی چـاك وخراپیـان (سـلبی وإیجابی)، هەیە قەڵەم بێ یان کتێب (ئینتەرنێت یان تەلەفزیۆن یان مۆبایل...هتـد ئەوانە دەکرێ خاوەنەکەی بۆ چاکیان بـەکاربهێنێ یـان بـۆ خراپـە. بۆیـە پێویسـت دەکات ئەمانە بە یاسایەك ڕێك بخرێت یان لایەنی چاك وخراپیان ڕوون بکرێتەوە بـۆ ئەوەی ببنە مایەی بەختەوەری وئاسودەیی خەڵك. ئەو کاتەی خودای گەورە مرۆڤی دروست کردو هێنایە سەر زەوی، یاسای ژیانی بۆ دانا و لەرێی پێغەمبەرانەوە ئـەم یاسایەی بۆ خەڵك ڕەوانە کرد، بۆ ئەوەی هەموو شتەکان لە ژیـان بـەپێوەرو یاسـا بێ، مرۆڤ لەزۆر لایەنەوە حەزی لەخراپەیە وسـنور دەبـەزێنێ وەك خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ ﴾ (المعـارج:١٩-٢٠) واتە: بێگومان ئادەمی دروستکراوە بەچاوچنۆکییەکی تەنگەتیلە کە ناخۆشـییەکی تووش ببێت هاوار و ناڵەی دەست پێ دەکات. مۆبایلیش یەکێکـە لـەم ئامێرانـەی لایەنی چاکەو خراپەی هەیـە بـۆ هـەردوولا بـەکاردێت، بـەڵام کاتێـك بـۆ خراپـە بەکاردێت تـاوانی لێ دەکەوێتـەوە، دەبێتـە هـۆی کوشـتن و وێرانکردنـی چـەندین

خێزان، بۆیە بەپێویستمان زانی ئەم گرفتەش باس بکەین، لایـەنی ئـاداب و سـودو قازانج و زەرەرو زیان و چارەسەری بەکورتی دیاری بکەین.

## گرنگی مۆبایل:

مۆبایل ئەو ئامێرەیە بەکاردێت بۆ پەیوەندی کردن لەنێوان خـەڵك، دەتـوانی بەم ئامێرە بەکەمترین خۆماندوو کردن و کەمترین کات لەهـەر شـوێنێك و لەهـەر کاتێك بتەوێت پەیوەندی بکەیت.

گومان لەوەدانییـە کـە بەرهـەم هێنـانی مۆبایـل یەکێکـە لەهـەنگاوەکانی زانسـتی سـەردەم، لەسـەدەی بیسـتەمدا، دەتـوانی بـەم بەرهەمـە شـوانێکی نەخوێندەوار لە دەشتێك و گەشـتارێك لـەناو شـەمەندەفەر و کەشـتی و فرۆکـە و کەسێکی تر لە خواردنگەیەك وچایخانەیەك وشوفێرێك لەناو ئۆتۆمبێلێك وپیاوێکی کاسبکار و منداڵێك لە قوتابخانە و ئافرەتێك لەماڵەوە دەتوانن پەیوەندی بەیەکتری بکەن، لەهەر کاتێك وشوێنێکی بیانەوێ، کەواتـە مۆبایـل ئـامێرێکی زۆر گرنگـە لەوانەیە سودەکانی بەئاسانی نەژمێردرێن.

### چەند ئادابێکی گرنگ بۆ بەکارهێنانی مۆبایل:

١. بە سلاَو کردن دەست پێ بکە و وشەی (ئەلو)، (بەیانی بـاش)، (شـەوباش) بەکارمەهێنـە، بەسـلاَو کـردن و بـە بـەکارهێنانی (السـلام علیـك) (١٠) چـاکە وەردەگری.

٢. ئەو کاتانەی کاتی نووستن وپشوودان و نان خواردنن تەلەفۆن مەکە.

٣. لەکاتی چوونە ناو مزگەوت بۆ نوێژکردن دای بخەو نوێژ لە خەڵك تێك مەدە.

٤. ئەگەر جارێك زەنگت لێدا وەلاّمی نەدایەوە دەست بەجێ دووبارەی مەکەوە، ساتێك ڕاوەستە ودواتر دووبارە بۆی بکەوە.

٥. زەنگێکی وا لەسەر مۆبایلەکەت دابنێ گونجاو بێ لەگەڵ شەرعی خودا، نەبێتە مایەی بێزارکردنی خەڵك.

٦. لەکاتی تەلەفۆن کردن بۆ ژمارە تەلەفۆنێك، دڵنیایی لەسەر ژمارەکە بکەوەو بەهەڵە ژمارە لێ مەدە.

٧. نیوە زەنگ (نوکە) بۆ کەس مەکە، ئەمە تاوانەو سزای لەسەرە لەرۆژی دوایی، چونکە گاڵتە کردنە بەموسڵمان، گاڵتەکردنیش بە موسڵمان دروست نییە.

٨. قسەو گفتوگۆی بێ سود مەکە، کات لە برایەکەت بگری و زیانی ماددی بە خۆت یان بە ئەو بگەیێنی.

٩. تەلەفۆن مەکە بەبێ کار، کەسەکە بەقسەی بێ سود بێزار مەکە وەك بڵێی (دەمناسی، چۆن نازانی من کێم، دەوڵەمەندبووی، فەقیری ناناسیەوە) ئەوانە مەڵێ وخۆتی پێ بناسێنە شەرعی ترە. وەکو لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)دا هاتووە (قال جابر اتيت النيي (ﷺ) فدعوت فقال النبى (ﷺ) ((من هذا فقلت أنا فخرج وهو يقول ((أنا،أنا))[1] واتە: جابر دەڵێت هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر، لە دەرگام دا پێغەمبەر فەرمووی: ئەمە کێیە؟ منیش گوتم منم، پێغەمبەر هاتە دەرەوەو دەیفەرموو: منم منم.

١٠. مۆبایلەکەت خاوێن بکەوە لە وێنە و نامە و زەنگی بێ شەرعی.

[1]. البخاري ومسلم.

١١. ئایەتی قورئان و بانگدان لەسەر زەنگی مۆبایلەکەت دامەنێ دروست نییە، چونکە جاری واهەیە تۆ لە ئاودەستی و زەنگ لێدەدات ئەمە ناشەرعی یە ئایەت لە ئاودەست بخوێندرێت، یان ئایەتەکە تەواو نابێ تۆ دەیبڕی ئەمەش نابێ.

١٢. مۆبایلەکەت مەخە دەستی منداڵان ژمارە لێ بدەن وخەڵك بێزار بکەن.

١٣. ئەگەر کەسی بەرامبەر تەلەفۆنی هەڵنەگرت بیانوی بۆ بهێنەوە، دەبینی نەخۆشە یان لە شوێنێکە ناتوانێ تەلەفۆن وەڵام بداتەوە یان هۆکارێکی تر هەیە، وەك ئیمامی عومەر دەفەرمووێت: (التمس لاخیك سبعین عذرا). واتە: ( بۆ براکەت ٧٠ عوزری بۆ بهێنەوە)[1].

١٤. ئەو کەسەی پەیوەندیت پێوە کردووە لەکاتی تەلەفۆن کردن دەنگی تۆمار مەکە، تەنها بەپرسی کەسەکە خۆی نەبێ، وەهەروەها بەبێ پرسی ئەو مەیکە بە بڵندگۆی دەرەکی (سماعە خارجیە)، چونکە ناشەرعیەو تاوانە.

١٥. دوای تەواو بوونت لە تەلەفۆن کردن، مۆبایلەکەت (قوفڵ) بکە، نەوەك دەستت پێ بکەوێ بەبێ ویستی تۆ بڕوات بۆ یەکێکی تر.

١٦. ئەگەر لەناو نوێژی بووی لەبیرت کردبوو مۆبایلەکەت دابخەی، لەوکاتە زەنگ لێی دا، دەست بەجێ بیکوژێنەوە نوێژەکەت بەتاڵ نابێتەوە (إنشاءالله).

١٧. ئەگەر لە کۆڕو دانیشتن و وانەو وتار بووی مۆبایل بەرکارمەهێنە، چونکە پێچەوانەی ئادابی وانەیە، ئەگەر پەیوەندیەکە گرنگ بوو ڕووخسەت لە مامۆستاکە وەربگرە ئینجا تەلەفۆن بکە.

١٨. مۆبایلی هیچ کەس بەکارمەهێنە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لەخاوەنەکەی، وە

[1]. سوودم لەدەست نووسێکی مامۆستا زرار گرتکی وەرگرتووە.

ئەگەر ڕێگەشی پێتدا، نابێ تەماشای ناو و ژمارە تەلەفۆنەکانی ناو مۆبایلەکە بکەیت، چونکە ئەمە دەچێتە (بابی خیانەت).

**١٩.** لەکاتی قسەکردن بەمۆبایل لەناو کۆڕو دانیشتن دەنگت زۆر بەرزمەکەوە ببێتە مایەی تێکدانی دانیشتنەکە و بێزار کردنیان.

**٢٠.** خۆدەرخستن لەناو کۆڕو دانیشتن بەوەی کە خاوەنی کۆمپانیایت یان کەسێکی زۆر زانایت یان هەر بانگەشەیەکی تر کە مەبەستی خۆدەرخستن بێ حەرامە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((المتشبع بما لم يعطِ كلا بسِ ثوبى زور))[1] واتە: خۆتێرکەرێك خۆی هەڵکێشێت وەکو ئەوە وایە کە پۆشاکی ناهەقی پۆشی بێت.

**٢١.** لەکاتی قسەکردن چاودێری خودا لەسەر قسەکانت دابنێ، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾ (ق:١٨) واتە: (هەر قسەیەکی لە دەم دەردەچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە، تۆماری دەکات).

**٢٢.** سوپاسگوزاری خودای لەسەر بکە. وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمان دەکات و دەفەرمووێت: ((اللهم ما اصبح بي من نعمة او باحد من خلقك فمنك وحدك لا شريك لك فلك الحمد و لك الشكر)). واتە: ئەی پەروەردگار کاتێك بەیانی دەکەمەوە بە نیعمەتێکی تۆ یان تاکێکی تر لە دروستکراوەکانت نیعمەتی لەگەڵ دەکەی هەر لە تۆیەو تاك و بێ هاوبەشی سوپاس و ستایش بۆ تۆ.

**٢٣.** نیازت پاك بێ لە بەکارهێنانی مۆبایل. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((من هم بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة))[2]. واتە: کەسێك نیازی کردەوەیەکی چاکی هەبێ نەتوانێ بیکا خودای گەورە چاکەیەکی بۆ دەنووسێ.

---

[1]. رواه الشيخان .

[2]. رواه مسلم

٢٤. بەدەنگی نزم قسە بکە. وەك خودای گەورە دەفەرموویێت:﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴾ (لقمان:١٩) واتە: (بەدەنگی هێواش و لەبار گفتوگۆ بکە و بدوێ، چونکە بەڕاستی بێزارترین و ناخۆشترینی دەنگەکان دەنگی گوێدرێژەکانە).

٢٥. لە نێو کۆڕ و دانیشتن ڕوخسەت وەربگرە. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: ((لیس منا من لم یوقر کبیر)) واتە: لە ئێمە نییە کەسێك ڕێز لە گەورە نەگرێت.

٢٦. ئەگەر دوو کەس بە یەکەوە بوون مۆبایلیان بەکاردەهێنا، ئەوە نابێ پستە پست بکەن، چونکە حەرامە. قال (ﷺ) ((اذا کنتم ثلاثة فلا یتناجی اثنان دون الاخر)). واتە: ئەگەر ئێوە سێ کەس بوون، دوانتان بەیەکەوە پستە پست مەکەن.

٢٧. ئەگەر لەگەڵ ئافرەتان قسەت کرد بە مۆبایل ووشەی خۆشەویستی و دلّداری بەکارمەهێنە حەرامە، بەڵکو ووشەی (دایکم یان خوشکم) بەکاربهێنە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((ما خلا رجل بامراة الا وکان الشیطان ثالثهما)) واتە: هەرکاتێك پیاو و ئافرەتێك بەتەنها بەیەکەوە بوون ئیلا شەیتان دەبێتە سێ یەمیان.

**لایەنە چاکەکانی مۆبایل:**

وەك لەپێشدا ئاماژەمان پێدا کە هەموو سودەکانی مۆبایل نایەتە هەژمار، بەلاّم لێرەوە چەند خالّێك بەکورتی دەژمێرین:

١. دەتوانی زۆر بەئاسانی لەکاتێکی کەمدا بەهەر شوێنێك بتەوێ پەیوەندی بکەی، لەگەل خزم وکەس و دۆستان وەلە هەوالّیان بپرسی.

٢. کاتت زۆر بۆ دەگەڕێنێتەوە.

٣. هۆكارێكی گواستنەوەیە لەنێوان خەڵك.

٤. بەماوەی چەند خولەكێك دەتوانی (سیلەی ڕەحم) لەگەڵ خزم و دۆستان بەجێ بگەیێنی.

٥. لەكاتی لێ قەومان بەزووترین كات كەس وكارو دامودەزگای حكومی ئاگادار دەكەیتەوە.

٦. بۆ ئادارگردنەوەی دەزگاكانی ئاشایش لەهەر كەسێكی تاوانبار و خوێنڕێژ بەبێ ئەوەی بزانی كە تۆی هەواڵت داوە.

٧. بۆتە هۆكارێكی زۆر بەهێز بۆ بازرگانی كردن لە ناوەوە ودەرەوە.

٨. زۆر سودی هەیە بۆ لایەنی ئابووری وپارەو پولێكی زۆر دەگێڕتەوە بۆ هەموو تاكێك.

٩. هۆكارێكە بۆ ئاگاداركردنەوەی كاتی نوێژو (مەوعید)و وەبیرهێنانەوە.

١٠. ئامێرێكی بەسوودە بۆ دانانی قورئان ودوعا و زیكرەكان، بۆ لەسەر خوێندنەوەو وگوێ ڕاگرتن.

١١. تیادا تۆمار كردنی وتار و شتی بەسود وگواستنەوەی بۆ كەسێكی تر.

١٢. كامێرایەكە بۆ وێنەگرتن لەهەموو كات وساتێكدا.

١٣. كاتژمێرێكە بۆ كاتەكان.

١٤. ژمێریارێكە بۆ لێكدانەوە و ژمێركاری.

١٥. ڕووناكییەكت پێ دەبەخشێ لە شوێنی تاریك.

١٦. ئەرشیفێكە بۆ هەڵگرتنی هەندێ شتی تایبەت.

١٧. بەكاردێت بۆ پرسيارو وەلاٌمی شەرعی لەناوەوە ولەدەرەوەی ولاٌت.

١٨. دەتوانی لەڕێی مۆبايل دەعوە وبانگەوازی پیٌ بكەی.

١٩. سالٌنامەيەكە بۆ دياری كردنی مانگ و رۆژ.

٢٠. هێلٌێكی ئينتەرنێتی بزۆكە كە دەتوانی بۆ گشت شوێنێكی ببەيت وەهەروەها چەندين شتی گرنگی لێوە دابەزێنی.

**نامە ناردنی مۆبايل وسودەكانی:**

١. بۆ كاتی بۆنەكان بەكەمترين پارە زۆرترين خەلٌك ئاگادار دەكەيتەوە.

٢. بە نامەيەك ڕۆحی خۆشەويستی و برايەتی نویٌ دەكەيتەوە لەگەلٌ موسلٌمانان.

٣. لە كاتی نامە ناردن جۆرێك لە ئازادی هەلٌبژاردنی كاتی تێدايە.

٤. وەك قسەكردن بە مۆبايل زەرەری تەندروستی نييە.

٥. بۆ كەسی كەڕولاٌل نامە ناردن زۆر سودی هەيە.

**زەرەرو زيان و لايەنە خراپەكانی مۆبايل:**

وەك لەسەرەتا گوتمان مۆبايل بۆ لايەنی چاك وخراپ بەكاردەهێنرێت، لايەنە چاكەكانی نايەنە ژمار، لەگەلٌ ئەوەشدا لايەنە خراپەكانی كارەساتەكانی جەرگبڕن و شوێنەواری لەدوای خۆی بەجیٌ دەهێلٌیٌ وجاری واش هەيە درێژە دەكێشی وبەهيچ جۆرێك چارەسەر ناكرێت.

بۆيە ناويان ناوە (مفاعل نووی صغير) زەرەر وزيانی بۆ چەند لايەنێك هەيە ئايينی و ڕەوشتی و تەندروستی وئابووری بەپشتيوانی خودا تيشك دەخەينە

هەریەك لەم لایەنانە بەتایبەتی لایەنی ئایینی و ڕەوشتی، چارەسەریشی بۆ دیاری دەکەین.

### زەرەرو زیانی مۆبایل بۆ لایەنی ئایینی و ڕەوشتی:

ترسناكترین زەرەرو زیانی مۆبایل لەم لایەنەوە وتووێژ كردنی نێوان پیاوو ئافرەتی بێگانە یان كچ وكوڕی بێگانەیە.

### هۆكارەكانی ووتوێژكردنی ناشەرعی لەنێوان پیاوو ئافرەت یان كوڕو كچ بەمۆبایل:

ئەم دیاردە ترسناكە بۆتە هۆی تێكدانی چەندین ماڵ وچەندین خێزانی لێك هەڵتەكاندووە و ئافرەت لەسەری تەڵاقدراوە و كچ لەسەری كوژراوە وچەندین منداڵ بەوهۆیەوە بێ سەرپەرشتیار بووینە گرنگترین هۆیەكانیشی ئەمانەن:

**یەكەم:** ئەو كەسانەی بەم دیاردە ترسناكە خەریكن بەشێكی زۆریان لە ئایین بێ ئاگان و نازانن ئامانجی ژیان چییە:

ئەو كەسانە ئامانج لەلایان بۆتە تێركردنی هەوەس و ئارەزوەكانیان و بەتەواوی ملكەچی فەرمانەكانی شەیتانن، بێ ئاگان لە ناسینی خوداو پێغەمبەرو (ﷺ) ئیسلام. هەركاتێك مرۆڤ خودای گەورەی نەناسی بەتەواوی ترسی خودای لەدڵ دروست نابێ و ملكەچی هەواو ئارەزوەكانی دەبێت، شەیتان بە دوژمنی خۆی نازانێ، كەسێكیش ترسی خودای لەدڵ دانەبێ و لەسزاكانی ڕۆژی دوای نەترسێ بۆ

تێرکردنی ئارەزووەکانی هەموو هەنگاوێك دەنێت، جا ئەم هەنگاوە ناشـەرعی بێـت یان ببێتە ماڵ وێرانی بۆ خەڵکانێکی تر. ناشارەزایی لە ئایین وبێ ئاگـایی دەبێتـە هۆی دورکەوتنەوە لەجێ بەجێکردنی خواپەرستییەکان، کاتێك مرۆڤ بـۆ ماوەیـەك لەگەڵ خواپەرستییەکان دابڕێ، دڵی ڕەق دەبـێ و ترسـی خـودا لـەلای نامێنـێ و بەتەواوی دەبێتە بەندەی شەیتان و لەڕێی ووتوێژی ناشەرعیدا دۆستایەتی دەبەستێ وسەرئەنجام زینا و کۆمەڵێك گرفتی گەورەی لێ دەکەوێتەوە.

**دووەم:** زۆرێك لەو کەسانە لەسەرتاوە زۆر بەخراپی پەروەردەکراون لەلایەن دایـك وباوکیانەوە:

ئەو کەسانە هەر لەمنداڵیەوە لەسەر پـەروەردەی عەلمانیـەت و ئایـدیۆلۆژیای ئەوروپی ڕاهێنراون. هەر لەسەرەتاوە لەسەر تێکـەڵاوی پیـاو و ئـافرەت (سـفوری) وپشت کردن لە نوێژ وگاڵتە و بەدڕەوشتی گەورەکراون، بەرپرسیاریەتی گەورە هـەر باوکان ودایکانن، ئەوان بەرپرسی یەکەمن لە پەروەردەی منداڵـەکانیان پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((الرجل راع في أهله ومسئول عـن رعيتـه، والمرأة راعيـة في بيت زوجها ومسئولة عن رعيتها...))[1]. واتە: پیاو چاودێرە لەسەر ماڵ و خێزانی وە بەرپرسیاریشە لەسەر چاودێریەکەی وە ئافرەت چـاودێرە و بەرپرسـیارە لـەماڵی مێردەکەی.

کوا پەروەردەی منداڵ لەسەر خۆشەویستی خودا وپێغەمبەر (ﷺ)؟

کوا پەروەدەی منداڵ لەسەر قورئان وفەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)؟

[1]. رواه البخاري

کوا پەروەدەی منداڵ لەسەر خواپەرستیەکان بەهەموو جۆرەکانیەوە؟

کوا پەروەدەی منداڵ لەسەر هاتنیان بۆ مزگەوت و وانە و وتارەکان؟

کوا پەروەدەی منداڵ لەسەر ئادابی ئیسلامی بەهەموو بەشەکانیەوە؟

کوا پەروەدەی منداڵ لەسەر ڕێزگرتن لە هاوسێ و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کۆمەڵگا بەگشتی؟

گومان لەوە دانییە نەبوونی ئەم (مەفاهیمانە) هەڕەشەیەکی ترسناکە لەسەر کۆمەڵگاکەمان، بەشێکی زۆر لەکوڕان وکچان تەنها بەدوای تێرکردنی هەوەس و ئارەزوەکانیان دەگەڕێن کەس نییە دەستیان بگرێ وبەرەو بەها و ڕەوشتی بەرزەکانیان ببات. زۆریشیان لەماڵەوە ژووری تایبەتیان هەیە و ژمارە مۆبایلی تایبەتییان لایە، شەوانە تادرەنگی شەو گفتوگۆی ناشەرعی دەکەن، باوك لەبەر ماڵ و سامان بێئاگایە لە پەروەردەی منداڵ و دایکیش زۆر جار دەبێتە لایەنگیرو کارئاسانی بۆ کوڕان وکچەکانیان دەکەن!

## سێیەم: گرفتی ناو ماڵ و نەبوونی پێشەنگی چاك:

یەکێکی تر لەم خاڵە گرنگانە کە دەبێتە هۆی ئەم دیاردە ترسناکە گرفتی ناوماڵە، بەتایبەتی نێوان دایك وباوك، منداڵ لەبەری ڕادەکات و دوور دەکەوێتەوە، دەکەوێتە دەستی کۆمەڵێك دۆستی خراپ و لەوێ پەروەردە دەبێ، باوك ودایك دەبنە پێشەنگێکی خراپ بۆ منداڵەکانیان، پەروەردەی ئەم منداڵە بەبێ پێشەنگ لەڕێی فیلم و دوکانی ئەتاری و چایخانە و گازینۆ و سینەما دەبێت. ماڵی بێ گرفت و ئارام منداڵی بێ گرفت وئارامی لێ پەروەردە دەبێت. باشترین پێشەنگ ئەو کەسەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەپێشەنگ بگرێت، وەك خودای گەورە

دەفـــەرمووێت: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْأَخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (الأحزاب:٢١) واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خـوادا چاکترین نموونەی تەواو ڕێك وپێك هەیە تا چاوی لێ بکـەن و شـوێنی بکـەون، بـە تایبەتی بـۆ ئـەو کەسـانەی ڕەزامەنـدی خوایـان مەبەسـتە، سـەرفرازی قیامـەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بـەزۆری ئـەنجام دەدەن و زمانیـان پـاراوە بەیادی ئەو).

## چوارەم: هاوڕێی خراپ:

هاوڕێی خراپ لە هەردوو ڕەگەز هۆکارە بۆ بەدڕەوشت کردنی یـەکتر و نقـوم بوون لەنێو گوناھ وتـاوان. چـەندین کـچ ویسـتویانە ڕوو لـەخودا بکـەن و ڕێگـای ئیسـلام بگرنەبـەر، هاوڕێکـەی کـاری تێکـردووە لـەڕێ لایـداوە. چـەندین کـەس ویستویەتی تەوبە بکات و بگەڕێتەوە هاوڕێیەکەی نەیهێشتووە بیربکاتـەوە، بـەرەو گومڕایی بردووە. زەرەری دونیاو دوارۆژی پێگەیانـدووە. خـودای گـەورە ئاگـاداری کردینەوە لە ترسناکی هاوڕێی خراپ، چەندە ماڵ وێرانی یە بـۆ ڕۆژی دوایـی، وەك دەفـــەرمووێت: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾(الفرقان:٢٧-٢٩) واتـە: (ڕۆژێـك دێـت سـتەمکار قەپ دەکات بەهەردوو دەستی خۆیدا و گاز لە هەردوو دەستی خۆی دەگرێـت (لـە پەشیمانیدا) و دەڵێت: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێبازی ئیمانم بگرتایە. مەرگ بۆ خـۆم، خۆزگـە فـلاَن کەسـم نەکردایەتـە هـاوەڵ و دۆسـتی خـۆم (چـونکە سـەری لێشێواندم). بەڕاستی گومڕاو وێڵی کـردم لـە بەرنامـەی خـوا، دوای ئـەوەی پـێم

ڕاگەیەنرابوو، شەیتان هەمیشە و بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بۆ گوناه و تاوان، لەکاتی تەنگانەشدا پشتی بەردەدات.

کەواتە پێویستە لەسەر هەموو دایك و باوکێك زۆرترین توانای خۆیان بەکاربهێنن لەوەی کە باشترین هاوڕێ بۆ منداڵەکانیان هەڵبژێرن، نەهێڵن لەگەڵ هاوڕێی خراپ ڕێگە بگرن، بەهەموو شێوەیەك ئاگاداربێ منداڵەکەی دوور نەکەوێتەوە لەنوێژکردن وگاڵتە بەئایین نەکات، خەریك نەبێ بەگاڵتەکردن و شتی بێ سوود. ئاگاداربە کچەکەت (سفور) نەبێ و گوێ لە گۆرانی ناشەرعی ڕانەگرێ بەدیار فیلمی ڕووت دانەنیشێ و ڕۆژنامەو گۆڤاری ناشەرعی نەخوێنێتەوە چونکە لەڕێی ئەوانەوە گفتوگۆی ناشەرعی بە مۆبایل فێردەبێ ودواتر ئەنجامی دەدات.

## گرنگترین زەرەر و زیانی هاوڕێی خراپ:

١. هاوڕێی خراپ لەڕێی خودا لات دەدات. ئەعشی کوری قەیس ویستی (بەیعەت) بداتە پێغەمبەر (ﷺ)، لەڕێگا تووشی هاوڕێکانی بوو، ڕێیان پێ گرت و باسی ئایینی باب وباپیرانیان و گاڵتە و شەرابیان بۆ کرد تا پەشیمانیان کردەوە، لەڕێگا ولاغەکەی وەرگەڕایەوە، دواتر ئەعشی بەکافری مرد[1].

هەروەها کاتێك ئەبو تالێب لە سەرەمەرگ بوو پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو ((یا عم: قل لاإله الا الله كلمة أشهدك بها عند الله))[2] واتە: ئەی مامە بڵێ (لاإله الا الله) وشەیەکە دەبێتە شایەت بۆت لەلایەن خوداوە. ئەبو جەهل و

[1]. لە کتێبی (المعاكسات الهاتفية) وەرگیراوە.
[2]. رواه بخاری

عەبدوڵلاّ کوری ئومەیە پەشیمانیان کردەوە و بەکافری مرد. تەماشاکە چۆن هاوڕێی خراپ بەرەو ئاگری دۆزەخت دەبات.

٢. شتی خراپت لەبەرچاو جوان دەکات تا تووش دەبێت.

٣. لە خواپەرستی تەواو ساردت دەکاتەوە.

٤. لە کۆڕی پیاوچاکانت دوور دەخاتەوە بەرەو کۆری شەیتانەکانت دەبات.

٥. ئەو هاوڕێیانەی پێت دەناسێنێ ئەوانیش خراپن ڕۆژ بەڕۆژ خراپەکان زیاد دەبێت.

٦. کۆڕو دانیشتنەکان بۆ دونیاو دوارۆژ پەشیمانی و ناخۆشی لەدوایە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((مامن قوم يقومون من مجلس لم يذكروا الله تعالى فيه إلا قاموا عن مثل جيفة حمار وكان ذلك المجلس عليهم حسرة يوم القيامة))[(١)] واتە: (هیچ کۆمەڵێك نییە لە کۆڕێك هەڵبستن و زیکری خودای تێدا نەکەن ئیلا ئەوانە وەك ئەوە وان لەسەر گوێ درێژێکی بۆگەن هەڵسابن وە ئەم دانیشتنەشیان لەڕۆژی دوای پەشیمانی لەسەرە).

ئەی خوشکی بەڕێز ئاگاداربە هاوڕێی خراپ مەگرە تووشی سەرشۆڕی دونیاو دوارۆژت دەکات، چەندین لە خوشکان بەهۆی هاوڕێی خراپ تووشی سەرشۆڕی بوون یان کوژراون لەم پێناوەدا. گەنجی بەرێز خۆت بپارێزە لە هاوڕێی خراپ، ڕێی خودا بگرەو سەربەرزانە بژی، بەختەوەری دونیاو دوارۆژی.

---

(١). رواه أبو داود والترمذی

**پێنجەم: فشاری دەرونی بەهۆی درەنگ ژن هێنان:**

ئافرەتانی ئـەمڕۆ بەشـی زۆری (سـفورن) و تێکـەڵاون لەگـەڵ پیـاوان، ئـەم تێکەڵی و (سفوریە) هێزی هەوسبازی لەلای کوڕو کچ زیاد دەکـات و ئـەم ئـارەزو هەوەسە پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر دەرونی گەنجان لە کوڕ و کـچ، سـەر دەکێشـێ بـۆ لادانی گەنجان و پەنا دەبەنە بەر گفتوگۆ بە مۆبایل لەگەڵ یەکتر، لەم ڕێیەوە گـەنج دەیەوێ هەندێك لە فشاری دەرونی کەم بکاتەوە، بە تایبەتی ئەم کوڕو کچانەی کە لەخوداو وتاری ئایینی دوورن! وزەو هەوەسی جووتبون غەریزەیـەکی سروشـتی یـە خودای گەورە بە هەموو کەسێکی بەخشـیوە ڕێگاشـی بـۆ دانـاوە تـا هاوسـەنگی بکات و نەبێتە هۆکارێکی خراپ، هاوسەگیری داناوە بۆ گەنجان تاوەکو تووشی ئـەم فشارە نەبن، کاتێ لە سروشـتی خۆیـان لادەدەن و درەنـگ ژن دەهێـنن، هۆکـاری خراپی لێدەکەوێتەوە.

**شەشەم: کاریگەری ڕاگەیاندن:**

ناکرێ ئێمە بێ ئاگابین لەوەی کە ڕاگەیاندن بـە هەرسـێ جۆریـەوە (بینـراو، بیستراو، خوێنراو) دەتوانێ کۆمەڵگا بەرەو لایەنی چاك و خراپ ببات ئەگەر چـاك بەکارهات ئەوا کۆمەڵگا چاك دەکات، وەئەگەر خراپ بـەکارهات ئـەوا کۆمـەڵگا خراپ دەکات.

ڕاگەیاندن ئەمڕۆ کاریگەریەکی بەهێزی هەیە لە تێکـدانی کـوڕان و کچـان، فیلمی ڕووت و خۆشەویستی و گۆرانی و سەماکردن دڵی کوڕ و کچانیان بۆ یەکتری لەرزاندووە، بەجۆشـێکی زۆرەوە بـەدوای یـەکتردا دەگـەڕێن بەتایبـەتی لەڕێگـەی

مۆبایل. شاشەکانی تەلـەفزیۆن بـەزنجیرەی دۆبلاژکـراو و گـۆرانی لەگـەڵ ئـافرەتی ڕووت، بەناوی خۆشەویستی عەقڵی کـوڕو کچـانی بـردووە، یـەکێك لـە تۆبـەکارە ئافرەتەکان دەڵێت، ئـەو گـۆرانی و زنجـیرە دۆبلاژکراوانـە وای لێکـردم هـەوەس و ئارەزوی واجولاندم هەر گەنجێك پەیوەندی پێوە بکردمایە وەلامم دەدایەوە.

ئێستا ڕاگەیانـدن دەوری ترسـناکی هەیـە لەپـەروەردەی خـراپ و تێکـدانی کۆمەڵگا. یەکێك لە بەرنامە ترسناکەکان ئەوەیە لەڕێی تەلەفۆنەوە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان یان لەڕێگەی ڕادیۆ لەدوای کاتژمێر (١٢)ی شەو لەگەڵ کچان بـاس لەوە دەکەن کێت خۆشدەوێت، لەگەڵ کێ پەیوەندیت هەیە ،چەند ساڵە بەیەکـەوەن، لەم ڕێگەیە بە تەواوی شەرمی کچان لە قسەکردن لە ڕێگەی تەلەفۆنـەوە نـەماوە. کە زۆر بە سادەیی و بەبێ شەرمی هەر کاتێکی بیەوێ یـان هـەر ژمارەیـەك بـۆی بکات بەبێ هەڵوەستە وەلامی دەداتەوە و باکی بە کەس نییە. بەشـێکی زۆر لـەو کوڕو کچانەی لەماڵەوە تەماشای فیلمی دۆبلاژکـراو دەکـەن هـەر لەگـەڵ یـەکتری دوای تەواو بوونی فیلمەکە لاسایی دەکەنەوە و خۆیان لەسەری ڕادەهێنن[1].

## حەوتەم: چاولێکەری کوێرانە:

زۆرێك لە کوڕان و کچان چاولێکەری کوێرانەی بەیەکتر دەکەن، پێیـان وایـە ئەمە شتێکی مۆدێرن و نوێیە، کاتێك گەنجێك دەبینـی وادەزانـی ئافرەتـە واخـۆی بەپۆشاکی ئافرەتان چواندووە و ئـافرەت خـۆی بەپۆشـاکی پیـاوان چـواندووە جلـی کوڕان بۆتە هی کچان، جلی کچانیش بۆتە هی کوڕان، کوڕەکان زۆریان زنجیر لـەمل

---

[1]. ئەگەر بمانەوێ لەسەر زەرەر و زیانی ڕاگەیاندن قسەبکەین کتێبێکی سەربەخۆی دەوێ بنوسرێ.

دەکەن وبازن لەدەست دەکەن وپرچیان وەك پرچی ژنان شانە دەکەن.

ئەم دیاردە کوێرانەیە کوڕو کچی ئەم ئوممەتە بەرزو بەڕێزەی لێك ترازاندووە و هەڵی تەکاندووە لەوانە:

١. چاولێکەری کوێرانە دەبێتە داروخانی دەرونی و ڕۆحی وبێ متمانەیی بۆ کەسەکە دروست دەکات و کەسایەتی تاکەکە دەتوێنێتەوە.

٢. چاولێکەری کوێرانە دەبێتە هۆی هەڵکردنی ئاشووب لەژیانـدا، خاوەنەکـەی تووشی گەورەترین گرفت دەکات.

٣. چاولێکەری کوێرانە (مقوەماتی) بوونی ئەم گەلە لەدەست دەدات و کلتورو داب و نەریتی باب وباپیران لەناو دەبات.

٤. چاولێکەری کوێرانە بەتایبەتی لە لایەنی ڕەوشتی دەبێتە هۆی ژێردەستەیی ئەم گەلە، چونکە گەنجان سۆزیان بۆ خاك وگەل و ولاّت نامێنێ تا بەرگری لێ بکەن.

٥. چاولێکەری کوێرانە گەورەترین هۆکارە بۆ بێ هێزی بیروهۆش و تێك شکانی کەسایەتی و بلاّوبوونەوەی نەخۆشی و بلاّوبونەوەی بەدڕەوشتی.

پێغمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لیس منا من تشبه بغيرنا، لاتشبهوا باليهود ولا بالنصارى))[1]. واتە: (لەئێمە نییە کەسێك خۆی بەغەیری ئێمە بچوێنێ، وەخۆتان بە جولەکەو گاورەکان مەچوێنن) هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((من تشبه بقوم فهو منهم)) واتە: (هەر کەسێك خۆی بەگەلێك بچوێنی ئەوە لەوانە).

---

[1]. رواه الترمزى

## مەترسی و زەرەرو زیانەکانی بەکارهێنانی مۆبایل بە ناشەرعی:

دیارە پەنجە خستنەسەر مەترسیەکان و زەرەرو زیانی بەکارهێنانی مۆبایل لەنێوان کوڕو کچ یان پیاو و ئافرەت لە ڕێگەی ناشەرعی بەشێکە لە چارەسەری ئەم گرفتە، ئەگەر مەترسیەکان دیاری بکرێن کوڕو کچ لەم مەترسیە ئاگادار بکرێنەوە لەوانەیە دەستی لێ هەڵگرن و وازی لێ بهێنن. گرنگترین مەترسیش ئەمانەن:

١. وروژاندنی شەهوەت و بڵاوبوونەوەی زینا.

٢. داڕوخانی خێزانی و لەدەست دانی منداڵ.

٣. گەمارۆدانی ژیانی کچان لەلایەن کوڕان بەهۆی وێنەگرتن یان دەنگ تۆمارکردن.

٤. بڵاوبوونەوەی هاوسەرگیری ناشەرعی.

٥. شەڕو یەکتری کوشتن یان کوشتنی ئافرەت و پیاوەکە.

٦. دوورکەوتنەوە لەخودا و کەوتنە ناو تاوان.

### ١. وروژاندنی شەهوەت و بڵاوبوونەوەی زینا:

کاتێك لەڕێگەی مۆبایلەوە دۆستایەتی پەیدادەبێت یەکەم هەنگاو بۆ کوڕان و کچان وروژاندنی شەهوەتە و دواتر سەردەکێشی بۆ زیناکردن، تاوانێکی ترسناکە مرۆڤ تووشی دەبێت، وەیەکێکە لە کارە گەورەکانی شەیتان کە زۆر شانازی پێ دەکات. ئەم وروژاندنەش سەرەتا بە گفتوگۆ دەست پێدەکات، هەر لەبەر ئەوەش

خودای گەورە ئافرەتانی پێغەمبەر (ﷺ) ئاگادار دەکاتەوە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾ (الأحزاب:٣٢) واتە: (نەوەکو ئەوەی دڵی نەخۆشە بوروژێت و نیازی خراپ بکات، هەمیشەو بەردەوامیش قسەی چاك و بەجێ بکەن (کە هیچ کەس نەتوانێت ڕەخنەی لێ بگرێت) ). ئەگەر دایکە بەرێزەکانمان کە خێزانی پێغەمبەرن (ﷺ) وەها ئاگادار بکرێنەوە لە لایەن خوداوە، دەبێ حاڵی ئێمە چۆن بێ لەم سەردەمە کە ئاشووب و شەهوەت زۆر بووەو دەرونەکان بێ هێز بوون ودوای ئەمە هەنگاو بە هەنگاو بەدوای شەیتان دەکەون، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴾ (النور:٢١) واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە شوێنی هەنگاوو نەخشە و پیلانەکانی شەیتان مەکەون). ئەم هەنگاوانە دەست پێ دەکات سەرەتا بە تەماشاکردن دواتر پێکەنین و سەلاّوکردن و قسەکردن و ژوان دانان و چاوپێکەوتن و ژمارە گۆرینەوەو گفتوگۆ بە مۆبایل و بە تەنها بوون و بەشداری شەیتان و لە کۆتایی زیناکردن. خودای گەورە پێشهاتەکانی زیناشی حەرام کردووە کە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ (الإسراء:٣٢) واتە: (هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناه و تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆلاّیە). ئەم زیناکردنە دەبێتە هۆی تێکدانی ڕەوشتی کۆمەڵگا و زەرەری تەندروستی و کۆمەلاّیەتی وئابوری...هتد لێ دەکەوێتەوە. زەرەرو زیانی زینا و هۆکاری توشبوون و نەخۆشی ئایدز و چارەسەری، هەموو ئەمانەش لەپێشتر باسمان لێوەکردووە.

### ٢. داروخانی خێزان و لەدەست دانی منداڵ:

ئەمڕۆ یەکێك لە هۆکارەکانی لێك هەڵوەشانەوەی خێزان مۆبایلە، لەڕێگەی ئەم مۆبایلەوە ناپاکی هاوسەرگیری زۆر بووەو پیاو لەگەڵ ئافرەتی خاوەن هاوسەر پەیوەندی دەبەستێت، بۆ زیناکردن نەك خۆشەویستی! چونکە ئافرەت ئەگەر مێردی هەبوو پەیوەندی لەگەڵ یەکێکی تر ببەستێ ئامانج لەوەدا ناپاکی هاوسەرگیری یە و زیناکردنە، لەگەڵ یەکتر! بۆیە لەم سەردەمەدا زۆربەی دیاردەی تەلاق هۆکارەکەی مۆبایلە، تەنها لەشاری هەولێر لەدادگا لەبەرواری ١ /٢٠٠٩/١ هەتا ئامادەکردنی ئەم (بەشەی کتێبەکە)، واتا تا ٢٠٠٩/١١/١ ژمارەی تەلاق دراوان کە زۆرینەی لەسەر مۆبایلە گەیشتۆتە (١٢٠٠) تەلاق، واتە (١٢٠٠) ئافرەت لەماوەی ١١مانگ بێوەژن بوینە، ماڵی (١٢٠٠) کەس لێك هەڵوەشاوەتەوە و چەندین منداڵ بێ سۆزی دایك و بێ پەروەردە ماونەتەوە.

### لەم بەسەرهاتە ڕاستەقینانە پەند وەرگرە:

ئەم بەسەرهاتانە بەسەرهاتی ڕاستەقینەن، ڕویانداوە بەهۆی خراپ بەکارهێنانی مۆبایل، باسی دەکەین بۆ ئەوەی کوڕان و کچان پەندی لێوەرگرن و دەست لە بەکارهێنانی مۆبایل هەڵگرن لە ڕێی ناشەرعی.

**<u>بەسەرهاتی یەکەم:</u>**

لە ماڵێکی ئارام پیاوێکی موسڵمان بۆ ماوەی ٩ ساڵە لەگەڵ هاوسەرەکەی بەیەکەوەن، دوو منداڵی چاوگەشیان هەیە، دواتر ئافرەتەکە لە ڕێی مۆبایلەوە پەیوەندی لەگەڵ کوڕێك دەبەستێ کە خزمی پیاوەکەیەتی، بۆ ماوەیەکی زۆر ئەم پەیوەندیە بەردەوام دەبێت، مێردی ئەم ئافرەتە دەڵێت ماوەیەك لە ژورەوە بەتەنها

قسەی بە مۆبایل دەکرد لێی کەوتمە گومان دواتر کە تەلەفۆنی بۆ دەهات دەچووە ژووریٚ و دەرگای لەسەر خۆی دادەخست، دواتر ژمارەی مۆبایلەکەم (تەحویلی) سەر مۆبایلی خۆم کرد هەر تەلەفۆنێکی بۆ دەهات بۆ منیش دەهات، زانیم کە خێزانەکەم دڵی بەیەکێکی ترەوەیەو، بۆیە مۆبایلەکەم لیٚ سەند بۆماوەیەك بیٚ مۆبایل بوو، ڕۆژێکیان لەماڵەوە بووم لەگەڵ منداڵەکانم یاریم دەکرد، نزیکی نوێژی نیوەڕۆ بوو وازم لەیاری هێناو چووم بۆ دەست نوێژ شوشتن، بەلای هاوسەرکەم تێپەڕیم لەچێشتخانەی ماڵەکەمان منیش گاڵتەم لەگەڵ کردو باوەشم پێداکرد، کاتێك هەستم کرد مۆبایلێکی لەنێو باخەڵی خۆی شاردۆتەوە. پێم گوت، ئەم مۆبایلە چییە؟ ئەی من مۆبایلم لیٚ نەفرۆشتووی؟ کەمێك تێکچوو، گوتی نازانم چی وچی ... دواتر گوتی ئەوە ئەو کوڕە بۆی کڕیوم کە خزمی خۆتە، گوتم چۆن دەبیٚ بەبیٚ پرسی من کاری وابکەیت...؟ دواتر تەلاٚقیدا، بنەماڵەو کەسوکاری ئافرەتەکە گوتیان ئەم قسەیەی ئەم پیاوە ڕاست نییەو بوختان دەکات، تا گرفتەکە چوو بۆ لای دادوەر، دادوەر بە نووسراوێکی فەرمی داوای لە کۆڕەك تیلیکوم کرد زانیاری ئەم دوو ژمارە تەلەفۆنەمان بۆ بنێریٚ کەلە نێوان ئەم ئافرەتەو پیاوەکەی پەیوەندی لەگەڵ هەیە، کۆڕەك وەلاٚمی ئەم نوسراوەی دایەوە و سیدی تۆمارکراوی نێوان ئەم ئافرەتەو پیاوەی پەیوەندی لەگەڵی هەبوو بۆ دادوەری نارد، دەرکەوت کە ماوەیەکی زۆرە ئەم دوو کەسە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە، سەر ئەنجام ئافرەتەکە تەلاٚقدرا. دواتر لەبەر ئەوەی ناپاکی هاوسەرگیری ئەنجامداوە، ئێستا بەندکراوەو لە بەندیخانەیە، هەروەها ئەو پیاوەی هاوبەشی ئەو ناپاکییە کردووە ئەویش خرایە بەندیخانە. ئینجا خوشك و برای بەڕێز تەماشای ئەم کارەساتە بکەو پەند وەربگرە.

**بەسەرهاتی دووەم:**

پیاو و ئافرەتێك بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەیەكەوە هاوسەرگیریان پێك هێنا، لەم ساڵە ئافرەتەكە لەڕێی مۆبایلەوە پەیوەندی بە كوڕێك دەكات لەگەڵی پەیوەندی ناشەرعی دەبەستێ، دواتر ڕۆژێك لەڕۆژان پیاوی ئافرەتەكە كوڕەكە و ئافرەتەكەی بەیەكەوە دەبینی دەستبەجێ ئافرەتەكە تەلاق دەدات ودەیباتەوە بۆماڵی باوكی، لەماڵی باوكی ئافرەتەكە دەڵی، من وام نەكردووە، ماڵی باوكی دەڵێن، ئێمە تۆو ئەو كوڕە دەكوژین ئەگەر واشت نەكردبێ و مێردەكەت بوختانت پێبكات ئەوا مێردەكەت دەكوژین، ئێستا ئەو گرفتە چۆتە دادگاو یەكلانەبۆتەوە لەم ڕۆژانە كوڕە گەنجەكە خۆی كوشت. براو خوشكی بەرێز پەند **وەربگرە.**

## ٣. گەمارۆدانی ژیانی كچان لەلایەن كوڕان بەهۆی وێنەگرتن یان دەنگ تۆماركردن:

گەمارۆدانی كچان لەلایەن كورەكانەوە بەهۆی وێنەگرتن یان دەنگ تۆماركردن وەك فشارێك بەكاردەهێنن، ئەو كەسانەی وەكو گورك بەدوای ناموسی خەڵك دادەگەڕێن بەردەوام بەدوای ئەوەن كە شتێكیان بكەوێتە دەست تاوەكو فشار بخەنە سەر كچەكە یان ژنەكە، تا ملكەچی فەرمان و كارە بۆگەنەكانیان بن. زۆر لەڕێی مۆبایل توانیویان وێنەی ئافرەتێك یان كچێك بەشێوەیەك لەكاتی ماچكردن یان دەستبازی یان ڕووتی لاشەكەیان یان هەرشێوەكی تر یان تۆماركردنی دەنگی لەكاتی پەیوەندی بەستنیان و قسەی ناشەرعی، دواتر كوڕەكە داوا لە كچەكە دەكات ئەگەر پێش هاوسەرگیری خۆی (تەسلیم) نەكات یان بیەوێ شوو بەكەسێكی تر بكات، ئەوا كوڕەكە هەڕەشەی لێ دەكات كە وێنەكەت یان دەنگت بلاو دەكەمەوەو ماڵەوەتان ئاگادار دەكەمەوە بەناچاری خۆی (تەسلیم) دەكات

ودواتر کوڕەکە وەك گورگ هەنگاوی گڵاوی خۆی دەنێ و دواتر وازی لێ دەهێنێ وە ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ ئافرەت هەبێ دەڵێ خۆت (تەسلیم) بکە بۆ نیازی گڵاوی ئەگەرنا مێردەکەت لەم دەنگە تۆمارکراوە یان وێنەگیراواننە ئاگادار دەکەمەوە بەناچاری ئافرەتەکە خۆی (تەسلیم) **دەکات**.

**بەسەرهاتی سێیەم:**

کچێك دەڵێت لەڕێگەی مۆبایلەوە لەگەل گەنجێك یەکترمان ناسی سەرەتا تەلەفۆنی کرد پرسیاری کرد ئەوە ماڵێ فلانە وتم نەخێر، دواتر لەسەرخۆ قسەی کرد ودەنگی خۆی نەرم کرد دواتر پاش چەند ڕۆژێك وازی نەهێنا و بۆ جاری دووەم و سێ یەم و چوارەم تەلەفۆنی کردەوە تا پەیوەندیمان دروست کرد و بانگەشەی ئەوەی کرد کە منی خۆشدەوێت و خۆشەویستیەکی پاکە، دواتر یەکترمان بینی و چەند جارێك بەیەکەوە دانیشتین و گفتوگۆمان کرد، خۆشەویستی و ڕاستگۆیی خۆیی بۆ دووپات کردمەوە، نەی دەتوانی بۆ ماوەی یەك چرکە لێم جیابێتەوە دواتر داوای وێنەی لێ کردم، وێنەی لەگەڵم گرت و پاش ماوەیەك ئەم گورگە داوای لێ کردم خۆم (تەسلیم) بکەم، وتی ئێمە هەر هاوسەرگیری دەکەین، کەوابوو با ئێستا دەست پێ بکەین، منیش گوتم نەخێر سەرەتا بمخوازە ئینجا. ئەم دڵ ڕەشە دەست بەجێ هەڕەشەی کرد و گەمارۆی دام وفشاری خستەسەرم و گوتی وێنەی تۆم لایە و قسەکانت لەلام تۆمارکراوە و شتی زۆری تۆم لایە ئەگەر خۆتم (تەسلیم) نەکەی ناموست دەبەم و وێنەکان بڵاودەکەمەوە، ئەمە بەسەرهاتێکە کە ژیانی کچێکی خستە تەنگ وچەڵەمەوە. ماڵوێرانی لەناو هەزاران بەسەرهاتی لەم شێوە پەیدابووە. ئەی خوشکی بەڕێز پەند وەرگرە[1].

(١). ئەم بەسەرهاتە لەکتێبی (المعاکسات الهاتفیة) وەرگیراوە.

**چۆن خۆت لە زیانەکانی مۆبایل دەپارێزی:**

ئامێری مۆبایل کۆمەڵێك زیانی تەندروستی هەیە بۆ مرۆڤ بەم هەنگاوانە دەتوانین زیانەکانی کەم بکەینەوە.

١. لەکاتی هاتنی زەنگ مۆبایلەکە لەلای سەرت نەبێ بەتایبەتی لەکاتی زەنگی یەکەم، چونکە لەو کاتەدا شەپۆلەکان زۆر بەهێزن.

٢. نابێ مۆبایلەکە لەلای گیرفانی دڵت بێ یان لەسەر سنگت بێ، چونکە شەپۆلەکان کاردەکەنە سەر دڵت و بۆڕییەکانی سنگ.

٣. باشترین شوێن بۆ هەڵگرتنی مۆبایل جانتای دەست و قایشی پشتێن و گیرفانەکانی قەمسەڵە و گیرفانی لای خوارەوەیە.

٤. ڕۆژانە شوێنی مۆبایلەکەت بگۆڕە گاریگەری شەپۆڵەکان کەم دەکاتەوە و لەسەر یەك کۆنابێتەوە.

٥. نابێ لەکاتی نووستن مۆبایلەکەت بەکراوەیی بەجێبهێڵی، چونکە کاردەکاتە سەر مێشك و شوێنەکانی تر.

٦. بەکارهێنانی (سەماعەی خارجی) شەپۆل و تیشکەکان زیاد دەکات، بە ئەندازەی (٣) بەقەدەر خۆی.

٧. نابێ مۆبایل لەسەر کەمەر و ناوقەد و نزیك گورچیلەکان دابنرێ، چونکە کار دەکاتە سەر گورچیلەکان و ئامێری هەرس.

٨. لەکاتی هەڵگرتنی مۆبایل بۆ قسەکردن بەگوێی چەپت وەڵام بدەرەوە، چونکە دوورترە لە دەماغ و کار ناکاتە سەری.

٩. لە شوێنی تەسك و بچوك و داخراو مۆبایل بەكارمەهێنە بەتایبەتی ئەگەر بواری كانزای لێ بوو. چونكە تیشكەكان پێچەوانەوە دەكاتەوە و زیاتر زیانی دەبێت.

١٠. خۆت بپارێزە لە زۆر قسەكردن لەیەك كاتدا، چونكە شەپۆل و تیشكەكان كاردەكەنە سەر گوێیەكان و دەماغ.

## ٤. بلاْوبوونەوەی هاوسەرگیری ناشەرعی:

گفتوگۆكردن بە مۆبایل لەڕێگەی ناشەرعی دەبێتە هۆكاری بلاْوبونەوەی هاوسەرگیری ناشەرعی.

سەرەتا گفتوگۆكردن دواتر چاوپێكەوتن و دەست لێدان و بەتەنیا بوون و دواتر تووش بوون بە زینا چارەسەریشی تەنها مارەكردنە، مارەكردنەكەش دەبێ بەشاراوایی بێ و بێ سەرپەرشتی (ولی امر)ی كچەكەی بێ، مارەكردنی كچیش بەبێ (ولی) دانامەزرێ كە ئەمەیان بۆچوونی زۆربەی زانایانە. دایكێك باسی كچەكەی خۆی دەكات و دەڵێ كچەكەم زۆرماندو و شەكەت دیاربوو بەپەلە گەیاندمە نەخۆشخانە تا چارەسەری بكەم، كچەكەی تەمەنی (١٥) ساڵان بوو، لەپۆلی سێی ناوەندی دەیخوێند، لەم نەخۆشیە خوێنی زۆر دادەنا دواتر دەركەوت منداڵی لەبارچووە، لەڕێگەی دكتۆر بۆم دەركەوت كە ئەم كچەی من هاوسەرگیری كردووە بەبێ ئاگای ئێمە بە كوڕێكی كۆلێژ ئەویش بەبێ ئاگاداری باوكی و كەس وكاری.

كچێكی تۆبەكار دەڵێت: (ئەم بەسەرهاتە دەگێڕمەوە بۆ ئەوەی كچان ئاگاداری خۆیان بن. كوڕێك هەڵی خەڵەتاندم و خۆشەویستیم لەگەڵیدا كرد لە

کاتێکدا وای لێکردم هۆشم لەدەست بدەم، باوەڕی بۆ دروست کردم کە ئێستا ئێمـە قوتابین با هاوسـەرگیری (عرفـی) بکـەین تـا قوتابخانـە تـەواو دەکـەین ئـەوکات ئاشکرای دەکەین منیش ڕازی بووم بەلاّم بـە مـەرجێك دەسـتم لێ نـەدات، بـەلاّم مەرجەکەی نەهێناجێ و بۆم هاتە پێش، هێدی هێدی تـا هـەموو شـتێکی لەگـەڵ کردم و ئێستا وازی لـێ هێنـاوم، تـەواوی ئـەم بەسـەرهاتە لەڕۆژنامـەی (الاهـرام القاهریە) وەرگیراوە لە ١٩٩٧/٥/١٦ .

کچێکی تر لە هەمان سەرچاوە دەڵێت: پەیوەندیم هەبوو لەگـەڵ یـەکێك لـە هاوڕێکانم پاشان داوای لێ کردم هاوەسەرگیری (عرفی) بکەین منیش ڕازی بـووم و خۆم (تەسلیم) کرد، دوای دوو مانگ سکم بوو، پێم گووت ئێستا سکم لەتۆ هەیـە پشتی لێ کردم و حاشای لێ کردم و لێم دورکەوتەوە بەپەلە خۆم گەیاندە دکتۆرێـك و منداڵەکەم لەباربرد، ئێستا متمانەم نەماوە بـە هـیچ کوڕێـك دوای ئـەوەی ئـەم کوڕە هەموو ئاواتەکانی ژیانی لە گۆڕنام! ئەمانە چەند بەسەرهاتێکی دڵتەزێنن کە لەڕێگەی مۆبایلەوە ڕویان داوە.

دیارە زۆرتـرو زیـاتر هـەن بۆیـە پێویسـتە دایکـان و باوکـان زۆر ئاگـاداری کچەکانیان بن بەجوانترین شێوە پەروەردەیان بکەن لەسـەر ئـاداب و ڕەوشـتی ئـەم ئیسلامە پاك وپیرۆزە ڕایـان بهێـنن و فێریـان بکـەن. زەرەرێکـی تـری ئـەم کـارە ناشەرعیە، کە وتووێژکردنە بـە مۆبایـل و پەیوەنـدی بەسـتنە بەناشـەرعی وا لـە کچەکان دەکات دڵیان بە کەسێکەوە ببەستنەوە چـاوەڕوان بـن بـۆ کـارێکی زۆر و نادیار کەچی کوڕەکەش هەر کاتێك کەسێکی تری بۆ هەڵکـەوت واز لەمـەدەهێنێ وەك گورگی دڕندە کەڵ وکرۆمیان دەکات و دواتر دەڵێ (ئەگەر ئـەم کچـە شـەریف بوایە پەیوەندی ناشەرعیانەی لەگەڵ منـدا نەدەبەسـت)! یـان دەڵێـت (پـێش مـن دەستی لەگەڵ چەندانی تر تێکەل کردووە). وە ئەگەر کوڕەکە خێزاندار بوو بە دوای

ئەم کارە نابەجێ یە گەڕا، ئەوا گرفتێکی تـر لــە مــاڵی کوڕەکـە دروسـت دەبێـت ئەویش دڵی بە خێزانەکەی نامێنێ مافی تەواوی نادات بەردەوام ئافرەتەکە هەسـت بە نائاسودەیی دەکات و ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە.

### ٥. شەڕو یەکتری کوشتن یان کوشتنی ئافرەت و پیاوەکە:

لێ کەوتنەوەی شەڕ لەنێوان دوو بنەماڵە و هۆز یان کوشتنی کچەکە بەتەنها یان کوڕەکە و کچەکە. پەیوەندی بەستن بە مۆبایل لەڕێی ناشەرعی شوێنەواری زۆر ترسناکی لێ دەکەوێتەوە زۆرجار بـەم هۆیـەوە دوو بنەماڵـە و هـۆز دوژمنـداریان کەتۆتە نێوان، یەکتریان کوشـتووە یـان زۆربـەی جارەکـان کچـەکە بۆتـە قوربـانی مۆبایل وحەزی گورگەکان و کوژراوە، جـاری واش هەیـە کوڕەکـەش بـەم هۆیـەوە **کوژراوە.**

**<u>لەم ڕووداوە ڕاستەقینە پەند وەرگرە:</u>**

کوڕێکی گەنج لەڕێی تەلەفۆنــەوە پەیوەنـدی لەگـەڵ ئافرەتێـك دەبەسـتێت، بۆماوەیەك لەگەڵ یەکتر پەیوەندیان دەبێت، ڕۆژێکیان کوڕەکە وێنەیەکی ئافرەتەکە دەگرێت لەکاتی کاری ناشەرعی و گاڵتەکردن لەگەڵ یەکتر، دواتر لەگـەڵ دۆسـت و هاوڕێکانی وەك پاڵەوانیەتیەك باسی دەکات و وێنەکە پیشانی هاوڕێکـانی دەدات، تا ڕۆژێك لەلای یەکێکی خزمی ئافرەتەکە ئاشکرای دەکات، خزمەکەی ئافرەتەکە دەناسێتەوە دەست بەجێ هەواڵ دەگەیەنێتە ماڵی ئافرەتەکـە، گرفتەکـە گـەورەبوو لەپاشـان مــاڵی بـاوکی کوڕەکـە نـەیانتوانی ئـەم دوژمنداریـە بکـەن، بەناچـاری

کوڕەکەیان کوشت. سەرئەنجام لەسەر یەك وێنەی مۆبایل ئـەم کـوڕە گەنجـە گیـانی خۆی لەدەستدا. جا برای بەڕێزم، گەنجی شیرین خۆت بەڕێگـەی ناشـەرعی خـەریك مەکە، ڕێی خودا بگرە، لەڕێی شەرعی (غەریزەی) خۆت تێـر بکـە، گونـاه کـردن ماڵ وێرانیە لەدونیاو دواڕۆژدا.

**بەسەرهاتێکی تر:**

ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیە و لە یەکێك لەگەڕەکەکانی شاری هەولێر ڕوویداوە.

لەم ماوەیە لەیـەکێك لەگـەڕەکانی شـاری هـەولێر دوو گـەنج بەشـەڕهاتن، یەکێکیان لووتی ئەوی تری شکاند دواتر شەڕەکە گەورە بوو لەنێوان دوو بنەماڵـە، سەرئەنجام دەرکەوت ئەم دوو کوڕە لە ڕێگـەی مۆبایـل پەیوەنـدیان لەگـەڵ کچـێك هەیە، ئەم کچە هەر جارەی کۆمەڵێك پارەیان پێ دەدات تاوەکو لەگـەڵی بـەردەوام بن ڕۆژێکیان پارەکە دەداتە کوڕەکەی تر کە نۆرەی ئەو نییە، لەبەر ئەوە ئەم شـەڕە ڕوویداوە، ئەم کارەساتەی لێ کەوتەوە. گومان لەوەدانییە کە چەندجار بەهۆی ئـەم پەیوەندییە ناشەرعیەوە چەندین کەس لەنێوان دوو بنەماڵە یان دوو هـۆز یـەکتریان کوشتووە تا ئێستاش ئەم دوژمنداریە بەردەوامە.

**٦. دوورکەوتنەوە لەخوداو کەوتنە ناو تاوان:**

کاری ناشەرعی نەخۆشـیەکی کوشـندەیە بـۆ دوورخسـتنەوەی مـرۆڤ لـەڕێی خودا، گەنجی واهەیە ڕۆژانە ئەوەنـدە بـەکاری ناشـەرعی و مۆبایـل خەریکـە وەك کەسێکی بەنج کراوی لێ هاتووە و هۆشی لەسەرخۆی نـەماوەو سـەرگەردانە، لێـی بۆتــە نەخۆشــیەك، ئاگــای لەنوێــژەکان نــەماوە بەتــەواوی لــە خواپەرســتیەکان دوورکەوتۆتەوە. هەرکات مرۆڤ لە خودا دوورکەوێتەوە دەچێتە سەر ڕێگای شەیتان

و لــە شــەیتان نزیــك دەكەوێتــەوە، كۆمــەڵێك شــوێنەواری خــراپ لەســەرخۆی بەجێدەهێڵێ لەوانە:

١. دڵی ڕەق دەبێ و كاری خراپی پێ ئاساییە.

٢. گوناهی لەلا زۆر بچوك دەبێتەوە.

٣. ئابڕووی بەتەواوی لەدەست دەدات.

٤. دەچێتە ژێر كاریگەری شەیتانەكان و (تەسلیمی) فەرمانی شەیتان دەبێت.

٥. پەیوەنــدی لەگــەڵ خــودای گــەورە بەتــەواوی دەپچــڕێت و لەگــەڵ شــەیتان پەیوەندی بەهێز دەبێت.

٦. بێ ئاگا دەبێ و بیر لەدوارۆژ ناكاتەوە.

٧. مۆری لەسەر دڵی دەدرێــت لەبــەردەوامی لەســەر گونــاهكردن وەك خــودای گــەورە دەفــەرموویت: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ (المطففـین:١٤) واتــە: (نەخێر، وانییە (ئەو نەفمانە تێناگەن و داناچڵەكێن) بەڵكو دڵیان ژەنگــی هێنــاوەو چڵكی گوناه دایپۆشیوە لە سەرەنجامی ئەو كاروكردەوانەی كە دەیانكرد).

## زەرەرو زیانی مۆبایل بۆ منداڵان:

منداڵان لە تەمەنی ٦ساڵی تا ١٢ ســاڵی پێویســتی بــە بــەهێزكردن هەیــە لەلایەنی لاشەیی ودەرونی و عەقڵی و ئایینی وپەروەردەیی، ئەم قۆناغــە قۆنــاغی دامەزرانــدن و گەشــەكردنە، بۆیــە دەبــێ لــە هــەموو زەرەرو زیانێــك بــەدووریان بخەینەوەو ئاگاداریان بــین، یــەكێك لــەم زەرەرو زیانانــە مۆبایلــە، منــداڵ مۆبایــل

بەکاردەهێنێ بۆ ئەم کارانە.

١. قسەکردن و گفتوگۆ

٢. تەماشاکردنی ئەم وێنانەی لەناو مۆبایلەکە تۆمارکراوە

٣. نامە ناردن

٤. ئەتاری و یاری کردن

٥. وێنەگرتن

لێرە کە منداڵ ئەم کارانە ئەنجام دەدات چەند زەرەرێکی هەیە:

١. کاتێکی زۆری بەفیڕۆ و بێ سوود دەڕوات، جاری واهەیە تا خەوتن ئەوا هەربەم کارە خەریکە و خەڵك بێزار دەکات و کاری نەشیاو ئەنجام دەدات.

٢. لەبەر خەریك بوون بە مۆبایل ئاستی زانستی زۆر دادەبەزێت و ئەرکەکانی خۆی لە قوتابخانە ئامادە ناکات، لەترسی هەڵنەستانی بە ئەرکەکەی قوتابخانە، لە قوتابخانە ئامادە نابێت.

٣. لەڕێی بلوتوزی مۆبایلەکەی تووشی زۆر کاری خراپ دەبێت، لەوانە وێنەی ڕووتی ئافرەتان و کردنەوەی ماڵپەری سێکسی وشتی تر، لە ڕاپۆرتێکی بەریتانی دەڵێت، ئێستا زیاتر لە (١٠٠) هەزار ماڵپەڕی وێنەی ڕووت و (جنسی) هەیە بۆ منداڵان، زیاتر لە (٢٥٪) منداڵان خەریکی ئەم کارەن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی خراپی ڕەوشتی منداڵ لەم تەمەنە کە ترسناکترین تەمەنە و ئەگەر بەخراپ پەروەردە بکرێن دواتر چاك بوونی مەحاڵە.

٤. منداڵان لەبەر ئەوەی لە زۆر ئادابەکان بێ ئاگایە بۆیە بە مۆبایلەکەی دەبێتە مایەی ئازاردانی خەڵك، لەکاتی نەشیاو تەلەفۆن دەکات و نامە بۆ خەڵك دەنێرێ، خەڵك بێزار دەکات، ئەمانە کاری خراپن.

٥. بەکارهێنانی مۆبایل زەرەرو زیانێکی زۆری لایەنی تەندورستی هەیە بۆ سەر لاشەی منداڵ، زۆرێك لە لێکۆلەرەوە پزیشکیەکان دەڵێن، بەکارهێنانی مۆبایل لەلایەن منداڵانەوە کار دەکاتە سەر گەشەکردنیان و کار لە کەسیەتی دەکات و خۆپەرست دەبێت و گەشەی عەقڵی بێ هێز دەبێت و لەگەڵ کۆمەڵێك زیانی تر.

٦. لەم تەمەنە مۆبایل زیانێکی زۆری هەیە بۆسەر لایەنی (جنسی)، منداڵ زوو فێری عەشق و خۆشەویستی و خۆخەریك کردن بەکاری (جنسی) دەکات، بەو ڕەوشتە نارێکە زۆر جار کاری خراپ ئەنجام دەدات لەگەڵ نزیکترین کەسی خۆی، چونکە نازانێ.

**چەند ئامۆژگاریەك بۆ باوكان و دایكان:**

١. پێشنیار دەكەین كە باوكان و دایكان مۆبایل بۆ منداڵی زۆر بچوك نـەكڕن، تا تەواو فێری ئادابی شەرعی دەبن.

٢. ئەگەر بۆیان كڕین، ئەو جۆرە مۆبایلەیان بۆ بكڕن، كە كـامێرا و سـتۆدیۆ و بلوتوزی نەبێت.

٣. لە هەموو كاتەكان نەهێڵێ مۆبایل بـەكاربهێنێ، تـەنها لـەكاتی پێویسـت نەبێت.

٤. بە بەردەوام چاودێری ناو مۆبایلەكەی بكرێ لە ژمـارەی نەناسـراو و وێنـەی خراپ و نامەی نێردراو.

٥. زۆر زۆر ئاگادار بن، مۆبایل بە ئاسانی لەدەستی كچـی تـازە پێگەیشـتو و منداڵ نەبێ، ئەمەیان گەورەترین زیانی لێ دەكەوێتەوە.

٦. فێری ئادابی بەكارهێنانی مۆبایل بكـرێن، ئـەو ئادابانـەی كـە شـەرعین و ئایینین تا لێی بترسێ بەخراپ بەكاری نەهێنی.

**چارەسەری ئەم گرفتە:**

چارەسەری گرفتی بەكارهێنانی مۆبایل لەڕێگەی ناشەرعی چۆن دەكرێت؟

چارەسەری ئەم گرفتە چەند هەنگاوێكی دەوێت:

**یەکەم: ترسان لەخوای گەورە:**

ترسان لەخودای گەورە وادەکات مرۆڤ خۆپاریزی بکات، ئەوەی فەرمانی خودایە جێ بەجێی بکات، وەئەوەی قەدەغەکراوە دەستی لێ هەڵگرێ، ناموسی خەڵك نازڕێنی، دەست درێژی بۆسەر براکەی ناکات، تێکدانی ماڵی خەڵك و لێك هەڵوەشاندنەوەی خێزانێك و گاڵتەکردن بە ناموسی خەڵك، ڕەوشتی کەسی موسڵمان نین. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: ((كل مسلم على المسلم حرام دمه وماله وعرضه))[1] واتە: خوێن وماڵ و ناموسی هەموو موسڵمانێك لەسەر یەکتر حەرامە. کەسێك لە خودا بترسێ لەکاتێ دەیەوێ تاوانێك ئەنجام بدات ئەم پرسیارانەی بۆ ئامادە دەبێت و کارەکە ناکات.

- ئایا خودای گەورە ڕازییە بەم تاوانە؟ نەخێر.
- ئایا خودای گەورە بێ ئاگایە لەم تاوانە؟ نەخێر.
- ئایا ئەگەر گوێڕایەڵی خودا بکەم دەبێ ئەم تاوانە ئەنجام بدەم؟ نەخێر.
- ئایا بەم تاوانە ئامانجی ژیانم دەپێکم و دەگەم بە ئاواتەکانم؟ نەخێر.
- ئایا خودای گەورە منی خۆش دەوێت ئەگەر ئەم تاوانە ئەنجام بدەم؟ نەخێر.
- ئەگەر لەکاتی ئەنجامدانی ئەم تاوانە خودای گەورە ڕق و تورەیی لێ هەڵگرتم کەس بەهانام دێت؟ نەخێر.

لەگەڵ چەند پرسیاری تر وا لەم کەسە دەکات دەست لەم تاوانە هەڵگرێت.

[1]. اخرجه الترمذي و احمد

**ترسان لەخودا چۆن دروست دەبێت؟**

١. ناسینی خودای گەورە.

٢. ترسان لە سزای ناو گۆڕ.

٣. ترسان لەسزای دۆزەخ.

٤. ترسان لە دیداری خودا.

٥. تێگەیشتن لەئامانجی ژیان.

٦. جێ بەجێکردنی فەرمانەکانی خودا.

٧. دەست هەڵگرتن لە قەدەغەکراوەکان.

٨. هەوڵدان بۆ گەیشتن بە بەهەشت.

**دووەم: باش تێگەیشتن لە ئامانجەکانی ژیان، بۆچی دروست بوویت:**

ئەگەر موسڵمان لە ئامانجی خۆی تێ گەیشت کە ئەم هاتووە بۆ ئەوەی جێنیشینی خودا بێ (لەسەر زەوی)، فەرمانەکانی جێ بەجێ بکات، دەست لە قەدەغەکراوەکانی هەڵگرێ، خواپەرستیەکان ئەنجام بدات، ووشەی (لاالە الاالله) بەرز بکاتەوەو ئاییینی خودا سەربخا، سەرئەنجام ئەوا کارێك ئەنجام نادات پێچەوانەی ئەم ئامانجە بێت. بەکارهێنانی مۆبایل لەڕێگەی ناشەرعی و زڕاندنی ئابڕووی موسڵمانان پێچەوانەیە لەگەڵ فەرمانەکانی خودای گەورە و هۆکاری دروست بوونی مرۆڤە، وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ (الذاريات:٥٦) واتە: بێگومان من پەری

و ئـادەمیزادم دروسـت نـەکردووە تـەنها بـۆ ئـەوە نـەبێت کـە مـن بپەرسـتن و فەرمانبەردارم بن.

ئەگەر لـەمانای ئـەم ئایەتـە وردبینـەوە بۆمـان دەردەکـەوێت هـەر کارێـك پێچەوانەی خواپەرستی وسەرپێچی فەرمانی خودا بێت ئـەوا ئـەم مرۆڤـە بـەکاری خۆی هەڵنەستاوە، سەرپێچی کردووە. موسڵمان یەك پەرستراوی هەیە کە (اللّه)یـە، یەك بەرنامەی هەیە کە ئیسلامە، یەك دەستوری هەیە کە قورئانە، یـەك ئامـانجی هەیـە کـە ڕازی بـوونی خـودا و بەدەسـت هێنـانی بەهەشـتە. ئەمـە ئاواتـەکانی موسڵمانە لەژیاندا، نەوەك گەڕان بەدوای ناموسی موسـڵمانان و تێکـدانی مـاڵی خەڵك و ئازاردانی دڵی موسڵمانێك، ئەمانە سەرپێچین و مانای ئەوە دەگەیەنێ ئەو کەسە (تەسلیمی) فەرمانی شەیتان و هەواو هەوەسی خۆی بـووە، بـەپیێ ئـارەزوە خراپەکانی خۆی بڕیار دەدات لە ئامانجە بنەڕەتییەکان نەگەیشتووە.

## سێ یەم: پەروەردەکردنی منداڵ لەسەر پەروەردەی ئیسلام:

پـەروەردەی منـداڵ لەسـەر ئـادابی ئیسـلام بناغەیـە بـۆ پێـك هێنـانی کۆمەڵگایەکی خـاوەن ڕەوشـت و دەسـت پـاك و داوێـن پـاك و بەویـژدان، تـاکی کۆمەڵگا تاکێکی سوودبەخش دەبێت بۆ کۆمەڵگا نەك زیانبەخش. ئەم پەروەردەیە لەسەر دوو بنچینە دەبێت.

**بنچینەی یەکەم:** پەروەردەی منداڵ لەسەر بیرو باوەڕی پاك:

پایەکانی باوەڕ وئیسلامی فێر بکرێ و پێغەمبەری (ﷺ) باش پێ بناسرێ، دوو هۆکار یارمەتی باوك دەدات بۆ پەروەردەکردنی منداڵ:

أ. هزری منداڵەکە بە خواپەرستی ببەستیەوە، فێری مزگەوتی بکەی و لە وانەی ئاپینی بەشداری بکات و فێری قورئانی بکەی.

ب. پابەندکردنی منداڵەکە بە سونەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

**بنچینەی دووەم: پەروەردەی منداڵ لەسەر ئادابی ئیسلام:**

پەیوەندی نێوان باوەڕ و ڕەوشت، وە پەیوەندی بیروباوەڕ و کردەوەی چاك دەبێ بەهێز بێت، باوەڕ بەبێ ڕەوشت، وە بیروباوەڕ بەبێ کردەوەی چاك کەموکوڕیە و سەرپێچیە، منداڵ لەسەر ئادابی ئیسلامی پەروەردە بێ دور دەبێ لە:

**أ**. خۆچواندن بە کافران لە هەڵسوکەوتی نابەجێ و ناشەرعی.

**ب**. خۆپاراستن لەگوێ گرتن لە گۆرانی و مۆسیقا و فیلمی ڕووت وبێ شەرعی.

**ج**. خۆپاراستن لە خۆچواندنی ئافرەتان بە پیاوان و بە پێچەوانەوەش.

**د**. خۆپاراستن لە (سفوری) و تێکەڵاوی کوڕو کچ و خۆپاراستن لە تەماشاکردنی ئافرەتان بە ناشەرعی.

**ه**. خۆپاراستن لەزیادەڕۆی لە خەرجکردنی پارە و خواردن و خواردنەوەی زۆر کە ببێتە مایەی بەفیڕۆدان و زێدە خەجکردن.

بێ ئاگایی دایك و باوك لە پەروەردەکردنی منداڵان وای کردووە زۆرینەی منداڵانی ئەم سەردەمە لە پەروەردەی تەواو بێ بەش بن، باوك ئەوەندە خۆی بە دونیاوە خەریك کردووە ماوەی بۆ منداڵەکانی نەهێشتۆتەوە لەگەڵیان دابنیشێ و پەروەردەیان بکات و چاودێریان بکات و لێ پێچینەوەیان لەگەڵ بکات.

ئافرەتێك بەهۆی خراپ بەكارهێنانی مۆبایلەوە خۆی لەدەست داوە دەڵێت، (توخوا پێم مەڵێن ئەی باوكت یان برات یان دایكت بۆ ئاگای لە تۆ نییە، بەخوا هەر كەس بە كارێكەوە خۆی خەریك كردووە، كەس نازانێ لەمماڵە چی دەكرێت، كەی دێیتەوە، كەی دەڕۆی، بۆكوێ دەڕۆی، چی دەكەی وچی ناكەی، كەس لێت ناپێچێتەوە). ئافرەتێكی تۆبەكار دەڵێت، كاتێك ئەم كردەوانەم ئەنجام دەدا بەچەند كاتژمێر قسەم لەگەڵ گەنجان دەكرد، چەندجار باوكم و ئەندامانی ماڵەوەمان مۆبایلیان لەدەستم دەبینی كە قسە دەكەم بەم كاتە زۆرە، نەیان دەگوت چی دەكەیت و لەگەڵ كێ قسە دەكەی. ئینجا باوكی بەڕێز بێ ئاگایی بگاتە ئەو ڕادەیەی منداڵ پەروەردە نەكرێ و لێ پێچینەوەی لەگەڵ نەكرێ، چۆن چارەنووسی لەوەش خراپتر نابێت.

## چوارەم: هاوڕێی خراپ:

زۆرێك لەو گەنجانەی لەژیاندا تووشی هەڵە دەبن، هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ هاوڕێی خراپ، هاوڕێی خراپ چەند خراپەیەكت تووش دەكات لەوانە:

١. تووشی لادانت دەكات لەڕێی خودا، كاریگەری لەسەر بیروهۆش و ڕەوشت بەجێ دەهێلێ و دەتگۆڕێ، بەرەو مەیدانی شەهوەتت دەبات.

٢. هەرچی ڕەوشتی ناڕێك و ناڕەوایە فێرت دەكات، هاوڕێ زۆر بەخێرایی ڕەوشت و هەڵسوكەوتی یەكتر هەڵدەگرن، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) پێمان دەفەرمووێت: ((المرء على دين خليله فلينظر احدكم من يخالل))[1] واتە: مرۆڤ لەسەر ئایینی هاوڕێیەكەیەتی، بابزانێ كێ دەكاتە هاوڕێی خۆی.

---

[1]. رواة ابوداود والترمذی

٣. تووشی پێشبڕکێت دەکات لە خراپەکردن، زۆرجار گەنجان لەسەر خراپەکردن پێشبڕکێ دەکەن و لەنێوان یەکتر وەك چالاکیەك باسی دەکەن، بەلام هاوڕێی باش لەسەر خواپەرستی و چاکە پێشبڕکێت لەگەڵ دەکات، هەروەکو خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ﴾ (المطففين:٢٦) واتە: ، جا با لەپێناوی ئەوەدا پێشبڕکێکاران پێشبڕکێ بکەن.

٤. ژیانت بەهەدەر دەدات و کاتت بەفیڕۆ دەدات، کەسێك نەتوانێ ئەم تەمەنە لەکاری چاك و خزمەتکردنی ئایین و ژینی بەکاربهێنێ، ئەوا ژیانی بەهەدەر ڕۆیوە، سوودیشی لەکات وەرنەگرتووە، تەمەنی گەنج تەمەنێکی زۆر پڕبەهایە، هاوڕێی خراپ هەمووی بە با دەدات. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((نعمتان مغبون فيهما كثير من الناس الصحة والفراغ)) واتە: دوو نیعمەت هەن بەشێکی زۆر لەخەڵکان بەفیڕۆی دەدەن ئەویش لەش ساغی ودەست بەتاڵیە.

٥. ئەو کۆڕو دانیشتنەی لەگەڵ هاوڕێی خراپ بەسەری دەبەیت، وەك ئەوە وایە لەسەر گوێ درێژێکی تۆپیو کۆ ببیتەوە، بەلام کۆڕو دانیشتن لەگەڵ هاوڕێی چاك و یادکردنی خودای گەورە پاداشتی لێ خۆشبوونە. وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((ما جلس قوم يذكرون الله الا ناداهم منادمن السماْء قوموا مغفورا لكم))[1] واتە: هیچ کۆمەڵێك کۆنابنەوەو (زیکری) خوا بکەن ئیللا لە ئاسمان بانگ دەکرێن، کاتێك هەڵدەستن خودا لێیان خۆشبووە.

٦. هاوڕێی خراپ لەڕۆژی دوایی دەبێتە دوژمن، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ﴾ (الزخرف:٦٧) واتە: (دۆستان و برادەران هەر هەموو لەو ڕۆژە دوژمنی یەکترن، هەموو ڕقیان

[1]. اخرجة احمد فی المسند

لەیەکتر دەبێتەوە، جگـە لـەو کەسـانەی کـە لەسـەر بنچـینەی تـەقواو خواناسـین کۆبوونەتەوەو برایەتییان بەرپاکردووە.

٧. هاوڕێی خراپ کارە خراپەکانت لەپێش چاو جوان دەکـات، وات لیٚ دەکـات لەسەری بەردەوام ببیت، بەلاٚم هاوڕێی چاك ئاوێنەیە بۆت، کاری خـراپ وەك خـۆی بەخراپ بۆت وەسف دەکات و کـاری جوانـت بـۆ جـوانتر دەکـات وەك پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((المؤمن مرأة المؤمن))[1] واتە: باوەڕدار ئاوێنەی باوەڕدارە.

٨. هاوڕێی خراپ هەر کـات لیـٚی بزربـوی ناپاکیـت لەگـەڵ دەکـات، لـەکاتیٚ لەگەڵتـە بـەرگریت لیٚ ناکـات بـە پێچـەوانەی هـاوڕێی بـاش ئیمـامی عومـەر دەفەرموویێت: (علیك باخوان الصدق فمشی فی اکنافهم فأنهم زین فی الرخاْ وعـدة فی الـبلاء) واتە: برای ڕاست بگرە لەنێویاندا بژی، ئەوان لەکاتی خۆشی جـوانن و لەکاتی ناخۆشی زەخیرەن).

٩. هاوڕێی خراپ دەتکات بە خۆشەویستی شەیتانەکان، ئەوان خۆشیان دەوێی، بەپێچەوانەوە هاوڕێی باش دەتکات بـە خۆشەویسـتی خـودا وەك لـە فـەرموودەی قودسیدا هاتووە ((وجبت محبتی للمتحابین فیً))[2] واتە: (خۆشەویستی خۆم واجـب کردووە بۆ دوو کەس لەپێناو من یەکتریان خۆش بوێت).

١٠. هـاوڕێی خـراپ وەك دڕك وایـە بـیٚ سـودە و زەرەرت پـیٚ دەگەیـەنیٚ، بەپێچەوانەی هاوڕێی چاك وەك داری بەردار وایە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((مثـل المؤمن مثـل النخلـة مـاأخـذت منهـا مـن شـی نفعـك))[3]. واتـە: (وێنـەی باوەڕدار وەك داری خورما وایە هەر چی لیٚ بکەیەوە سودت پیٚ دەگەیەنیٚ)

---

[1]. رواه ابوداود و الترمذی

[2]. أخرجة مالك فی الموطأ

[3]. رواه الطبرانی

برای گەنج خوشکی بەڕێزم، لەم هاوکێشەی نێوان هاوڕێی باش وخـراپ بـۆت دەردەکەوێ کە دوورکەوتنەوە لە هاوڕێی خـراپ پێویسـتە، هـەتا زووەو تـا مـاڵی وێران نەکردووی و کات ماوە وازی لێ بهێنەو هاوڕێی بـاش هەڵبـژێرە چارەسـەری گرفتی مۆبایل دەکات.

### پێنجەم: ژن هێنان وشوكردن:

ژنهێنان وشوکردن باشترین ڕێگا چارەیە بۆ کوڕان وکچـان. هـەر زوو بڕیـاری هاوسەگیری بدە و دەست هەڵگرە لە بەکارهێنانی مۆبایـل لـەڕێی ناشـەرعی، ئـەم سودانەشت پێ دەگەیەنێ:

١. خۆت بەتەواوی لە گوناھ دەپارێزی، دەست لە تاوانی مۆبایل هەڵدەگری.

٢. ئیمانت پێ تەواو دەبێت، دەرونت لە حەرام دوور دەبێت.

٣. ئارامی بۆ دڵ ودەرونت دەگەڕێتەوەو خۆشەویستی و (مەوەدە) دەچێژی.

٤. کۆمەڵگاکەت لە بەدڕەوشتی دەپارێزی.

٥. دوور دەبیت لە نەخۆشیە ترسناکەکان.

٦. وەچەی شەرعی لە کۆمەڵگا زیاد دەبێت، بەمە تاوان کەم دەبێتەوە.

٧. فێری بەرپرسیاریەتی دەبێت، لەگەڵ سوودی زۆری تر. وەکو لە پێشتر باسمان کرد

**شەشەم: ڕەچاوکردن وجێ بەجێکردنی ئادابی مۆبایل لەسەر شەریعەتی ئیسلام:**

**(١٠) خاڵی پێویست بۆ خوشکانی بەڕێز:**

**(چۆن خۆت لەو تەلەفۆنە دەپارێزی کاتێك دەزانی نیازی خراپە):**

١. ئەگەر ژمارەکە نەناسراو بوو هەڵی مەگرە، یان بیدە بەبراکەت یان کەسێکی خۆت هەڵی بگرێ.

٢. ئەگەر ژمارەی نەناسراوت هەڵگرت، سەرەتا تۆ دەست بەقسەکردن مەکە، ئەگەر لە قسەکانی دوودڵ بووی لەسەری دابخە.

٣. ئەگەر هەمان ژمارە دووبارەی کردەوە لەسەری هەڵمەگرە، یان لەوکاتە تەلەفۆنەکەت دابخە.

٤. لە قسەکردن درێژە بەقسە مەدە، لەگەڵ کەسی نەناسراو بەتایبەتی گەنج ئەگینا سەرنجت ڕادەکێشێ.

٥. زۆر متمانە بەو کوڕانە مەکە کە خزمتن، ئەگەر کەسەکە پابەندو ئایین پەروەر نەبوو، چونکە گەنجانی ئەمڕۆ بەشێکیان وەك گورگی برسی وان.

٦. ژمارەی خۆت مەدە بەهەموو کەسێ.

٧. لەکاتی ناوەخت مۆبایلەکە هەڵمەگرە، لەکاتی ناوەخت نیازخراپان تەلەفۆن دەکەن.

٨. ئەگەر ژمارە تەلەفۆنێك زۆر تەلەفۆنی بۆ کردی زوو مێردەکەت یان براکەت ئاگادار بکەوە.

٩. لە نامەناردن ئاگداربە بە هەڵە نامە بۆ دەستە خوشکەکانت مەنێرە،

نەوەك كەسێكی بێ ویژدان بەهەلی بزانێ و بانگەشەت لەدوا بكات یــان كەســێكی نزیكی تۆی لێ ئاگادار بكاتەوە و ئابڕووت ببات.

١٠. لەڕێی مۆبایل هاوسەری ژیانــت هەڵمەبــژێرە، ئــەی خوشــكی بــەڕێز ئــەو كەسەی لەڕێی مۆبایل بەدوای هاوسەر دەگــەڕێ بەشــی هــەرەزۆری بــۆ تێركردنــی هەواو هەوەسبازییە نەك هاوسەری شەرعی، ئەوەش بزانــە خوشــكی بــەڕێز ئــابڕوو شوشەیە بشكێ چاك بوونەوەی مەحاڵە.

## گرفتی دەیەم:
## کۆچ کردنی گەنجان بۆ وڵاتی کافران، هۆکار، چارەسەر

یەکێك لەو گرفت ودەردانەی گەنجەکانمان پێیەوە دەناڵێنن و خەونی پێوە دەبینن کۆچ کردنە بۆ هەندەران، بەتایبەتی بۆ وڵاتی کافران، ئەم دیاردەو گرفتە زۆربەی ماڵەکانی گرتۆتەوە، لەکاتێکدا ئاگاداری وڵاتی کافران نین کە شەپۆل دەکات لە بێ ئایینی و بەدڕەوشتی و مەی خواردنەوە و زیناکردن بە ئەندازەیەکە سنوری بۆ نییە، ئینجا کۆچ کردن بۆ ئەم وڵاتانە ئەی گەنج ئایینەکەت دەخاتە مەترسییەوە، لەلای موسڵمان چاکترین و بەنرخترین شت ئایینە. پاراستنی ئایین لەپێش پاراستنی ماڵ و گیان و وڵاتە. موسڵمان قوربانی دەدات بەهەموو شتێك بۆ پاراستنی ئایینەکەی ئەمەش لەژیانی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بەڕوونی دەردەکەوێ کە پێغەمبەر (ﷺ) وهاوەڵانی ماڵ و گیان و وڵاتیان بەجێ هێشت بۆ ئەوەی ئایینەکەیان سەلامەت بێ، پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك پیرۆزترین شوێن لەسەر زەوی بەجێ دەهێڵی، دەفەرمووێت: ((والله انك لاحب ارض الله الی الله، ولو لا أن قومك اخرجونی ماخرجت))[1]. واتە: (ئەی مەککە (والله) تۆ خۆشەویسترین زەوی خودای لەلای خودا، ئەگەر گەلەکەم دەریان نەکردبام دەرنەدەچووم). ئەوا ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێ) ماڵ و ژیان و گیانی دەخاتە مەترسییەوە لەبەر ئایینەکەی. کەواتە پاراستنی ئایین (واجبە). بۆیە ئێمە بە گرنگمان زانی حوکم و سود و زەرەرو چارەسەری ئەم گرفتە باس بکەین:

---

[1]. رواه الحاكم

**حوکم و جۆرەکانی کۆچ کردن بۆ هەندەران:**

حوکمی کۆچ کردن لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێك لـە کەسـێکەوە بـۆ کەسـێك و لەکاتێکەوە بۆ کاتێك جیاوازە، بۆیە نابێت حوکمێك دەربکەین و گشتگیری بکەین بەبێ ڕەچاوکردنی شوێن و کات و کەسەکە، کەواتە دەکرێ بڵێین حوکمی کۆچ کردن دابەش دەبێت بە پێنج بەش لەوانە:

**یـــــەکەم: کۆچ کردنی پێویست (واجب).**

**دووەم: کۆچ کردنی قەدەغە (حرام).**

**سێیەم: کۆچ کردنی ناپەسەند (مکروە).**

**چوارەم: کۆچ کردنی سونەت (مستحب).**

**پێنجەم: کۆچ کردنی حەڵاڵ (موباح).**

**پێناسەی کۆچ کردن لەڕووی شەرعەوە:**

زانایان هەندێك ڕای جیایان لەپێناسە کردنی کۆچ کردن هەیە، ئەویش لەبەر هەڵگرتنی مانای زۆر لە وشەی کۆچ (الهجرە).

ئیبن قوددامە و ئیبن عەرەبی و ئیبن تەیمیە و ئیبن حەجەر و ئیمامی شەوکانی ئەم پێناسەیان هەڵبژاردووە بۆ کۆچ کردن و دەڵێن: ((هی الخروج مـن دار الکفـر دار الاسلام))[1]. واتە (کۆچ کردن دەرچوونە لەشار و دەوڵەتی کوفر بۆ شـارو دەوڵـەتی موسڵمانان). هەروەها پێناسەیەکی جوان لە (محجم الفاظ ألقرأن الکـریم) داهـاتووە دەفەرموویێت: (الهجرة هی انتقال المؤمن من بلد الفتنة والخوف علی دیـن الی حیـث

---

[1]. مجموعة الفتاوی، المغنی فتع القدیر احکام القرأن فتح الباری

يأمن على دينه) واتە: (كۆچ كردن ئەوەیە جێ گۆڕینی باوەڕدارانە لە وڵات و شاری ئاژاوەو ترس لەسەر ئایین بۆ شوێنێك كە ئایینەكەی سەلامەت بێت) ئەم پێناسەیە فراوانترو گونجاوتر و گشتگیرترە بۆ ئەم سەردەمە.

**یەكەم: كۆچ كردنی پێویست (واجب):**

١. كۆچ كردن (واجب) دەبێت كاتێك موسڵمان ئایینەكەی لەم شوێنە بكەوێتە مەترسی و نەتوانێ دروشمەكانی ئەنجام بدات وەك نوێژو ڕۆژی و... هتد، یان بێ هێز بێ و بترسێ لەوەی ئایینەكەی یان ماڵ و گیان و ناموسی لەدەست بدات، لەو كاتەدا بەڕای كۆی زانایان كۆچ كردن لەم وڵاتە (واجب) دەبێت لەسەر ئەو كەسە بۆ وڵاتێكی تر كە ئایین و ماڵ و سامان تێیدا سەلامەتە و ئەمین دەبێت ئیبن كەثیر دەفەرمووێت: (اللهم الا ان يعرض الحال يقتطي الهجرة بسبب مجادرة اهل الحرب ودعم القدرة على اظهار الدين عندهم فتجب الهجرة الى دار الاسلام وهذا مالا خلاف فيه بين العلماء)[1]. واتە: (ئەگەر هاتو حاڵی كەسێك وای لێ هات وای دەخواست كۆچ بكات، بەهۆی ئەوەی نەتوانی ئایینی خۆی بەدەربخات و ئەنجامی بدات ئەوە لەسەری (واجب) دەبێت كۆچ بكات، ئەم بڕیارەش زانایان هەمویان لەسەری یەك دەنگن و جیاوازیان **نییە**.

٢. كۆچ كردن (واجب) دەبێت لەسەر كەسێك كەلە وڵاتێك بێت ئەم وڵاتە خراپەو تاوانی تێدا بڵاوبووبێتەوە (بیدعەی) تێدا بكرێت، نەتوانرێت فەرمان بەچاكەو نەهی لەخراپە بكرێت، پیاوانی خودا زۆریان شوێنی خۆیان بەجێ هێشتووە بەرەو شوێنی تر ڕۆیشتوون. سەعیدی كوڕی جوبەیر دەفەرمووێت: (اذا

---

[1]. البداية والنهاية ج٤٠ ص٢٠

عمل بالمعاص فی ارض فاخرج منها وتلا).: ﴿أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ﴾ (النساء:٩٧)[1] واتە (ئەگەر کردەوەی خراپ ئـەنجام درا لەشـوێنێك لێـی دەرچـەو برۆ، ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ئایا زەوی خودا فـراوان نییـە، ئێـوە کـۆچ بکـەن بـۆ ئەوێ). ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: (من بلی ببلدة تکثر فیها المعاصی ویقل فیها الخیر فلا غذرة له فی المقام بل ینبغی أن یهاجر لقولة تعالی) ﴿أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ﴾[2] واتە: (هەر کەسێك لەشارێك بوو تـاوانی زۆر لێ دەکـراو خێری تێدا کەم بوو (عوزری) نییە لەم شارەدا بمێنێتەوە، بەڵکو دەبێت کۆچ بکـات بەپێی ئەم ئایەتە). (ئایا زەوی خودا فراوان نییە، ئێوە کۆچ بکەن بۆ ئەوێ).

٣. لەسەر موسڵمانان (واجب) دەبێت کۆچ بکەن بـۆ شـوێنێك کـە موسـڵمانان تیایدا شارەزای ئیسلام نەبن، نەتوانن فەرمانەکانی ئیسلام بەتەواوی ئـەنجام بـدەن، لەو شوێنەش زاناو بانگخوازی لێ نەبوو فێریان بکات، چونکە خواپەرستی زانینـی تەواوی دەوێت ئەگەر نەزانی ئەوا (واجبە) خۆی فێر بکات. مادام (واجبێك) تـەواو نەبێت ئیللا بە شتێکی تر، ئەوە شتەکەش واجب دەبێـت (مـالایتم الواجـب الا بـه فهو واجب) خاوەنی تەفسیری منار لەبارەی کۆچ کردن دەفەرموێت: (وهذا الحکـم - اي الهجرة- فی کل من یقیم ببلد لست فیه علمـاء یقیمـون احکـام الـدین علیـه ان یهاجر الی البلد یتلقی فیه أموردینه واحکام شریعته)[3]، واتە: (ئەم حوکمە -کـۆچ کردن- بۆ هەر کەسێك جێنیشینی ئـەم شـارە بێـت کـە زانـای تێـدا نـەبێت کـە حوکمەکانی ئایین بەرپا بکەن، پێویستە ئـەم کەسـە کـۆچ بکـات بـۆ شـارێك کـە کاروباری حوکمی شەریعەتی خودای لێ هەبێت).

[1]. جامع احکام القرأن للقرطبی
[2]. احیاء علوم الدین
[3]. تفسیر المنار ج٢/ص٣٦٢

٤. کۆچ کردن (واجب) دەبێت بۆ فێربونی زانستێك، ئەم زانستە تەنها لەلای کافران دەست بکەویٚ، لەهەمان کاتدا موسڵمانان زۆر پێویستیان بەو زانستە بێت، وەك زانستی نوێی سەردەم لە تەکنەلۆژیاو زانستی گەردونناسی و بێجگەلە لەوانەش، بەم پێیە ئەگەر فەرمانڕەوای موسڵمانان دەبیٚ خەڵکانێك بۆ وڵاتی کافران بنێرێت تا ئەم زانستە وەدەست بهێنن.

٥. کۆچ کردن (واجب) دەبێت لەکاتێکدا فەرمانڕەوای موسڵمانان فەرمان بە هەندیٚ کەس بکات لە موسڵمانان تاوەکو لەم وڵاتانە باڵیۆزخانە و قونسڵخانەی لیٚ بکاتەوە بۆ ڕێکخستنی کاروباری وڵات لەگەڵ ئەم وڵاتانە. هەروەها لەسەر بانگخوازەکان (واجب) دەبێت بڕۆن بۆ ئەم شوێنانەی کە بانگخوازی لیٚ نییە، بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی خودا.

**دووەم: کۆچ کردنی قەدەغە (حەرام):**

جۆری دووەم لەم گرفتە ئەم کۆچ کردنانەیە کە حەرامە، دروست نییە گەنجی موسڵمانان کۆچ بکات لەشارو وڵاتی موسڵمانان بۆ شارو وڵاتی کافران، پێش ئەوەی بچینە سەر (فەتوای) زانایان بەپێویستی دەزانم زەرەرو زیانی کۆچ کردن بۆ هەندەران باس بکەم، خوای گەورە نیعمەتێکی زۆری بەسەر ئەم ئومەتە داباراندووە و چاکەی بەسەر ئومەتانی تر داوەو بەچاکترین ئومەتی داناوە، لەناو نیعمەتەکانیش بەنیعمەتی ئیسلامی شاد کردووە. ئەو ئیسلامەی کە بەرنامەی ژیانەو خودا پێی ڕازیە. ﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ **(المائدة:٣)** واتە: (ئەمڕۆ ئایین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاندو نازونیعمەتی خۆمم بۆ تەواوکردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو ئایینتان). بەڵام دوژمنانی

ئیسلام ئیرەیی بە موسڵمانان دەبەن و دڵیان پڕ لە ڕق و کینەو فیتنەیـە، بـەردەوام هەوڵ دەدەن موسڵمانان لە خشتە ببەن لـەڕێی ئیسـلام لایـان بـدەن، وەك خـودای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿ وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَـٰعُواْ ﴾ (البقرة:٢١٧) واتە: ( (بێگومان بێ باوەڕان) بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتـان لێ بکەن لە ئایینی پاشگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێـت)، هـەروەها دەفـەرمووێت: ﴿ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗ ﴾ ( النساء:٨٩) واتە: ( (ئەو دووڕووانە) ئاواتەخوازن کە ئێوەش بێ باوەڕ بن وەك خۆیان بێ باوەڕ بوون، ئەو کاتە (هـەردوو لاتان) یەکسان دەبن لە بێ باوەڕییدا). ئەم ئایەتەنە بەڵگەن لەسەر دژایەتی کافران بەرامبەر بە موسڵمانان. جۆرەها ڕێگا بەکاردەهێنن بۆ گـومڕاکردنی گەنجـەکانمان، یەکێك لەو ڕێگایانەی دەرگایان بۆ گەنجانی موسڵمان کردۆتـەوە تـاوەکو بگـەن بـە ئاواتی خۆیان. ئەی برای گەنجم نازانی خراپـەکاری زەرەر و زیـانی کـۆچ کـردن بـۆ وڵاتی کافران چەندە زۆرە. بەکورتی لەم چەند خاڵانەدا ئاماژەیان پێ دەدەین:

## زەرەر و زیانی کۆچ کردن لەسەر گەنجان:

١. کۆچ کردن بۆ وڵاتی کافران زیانی ڕاسـتەوخۆی هەیـە لەسـەر بـیرو بـاوەڕی گەنجەکان ولە ئایین لایان دەدات، زۆرێك لە گەنجەکانمان کاتێك دەگەنە وڵاتی کافران بۆ وەرگرتنی مانەوە (إقامە) خۆیان دەکەن بە گاور و جولەکە و بـوزی ئایینـەکانی تر.

٢. زۆربەی گەنجەکان لە کوڕ و کچ لایەنی ڕەوشتییان لەدەست دەدەن و تووشـی زینا دەبن. زۆرێك لە وڵاتی کافران پێشانگای فەرمیان هەیە بۆ کاری سێکسی هەر شارەو چەندین پێشانگای لێ هەیە ئافرەتان بـە ڕووتـی خۆیـان نمـایش دەکـەن بـۆ

پیاوان، هەر گەنجێك و یەكێك بە دڵی خۆی هەڵدەبژێرێ دواتر كاری سێكسی لەگەڵ دەكات. گەنج كاتێك دەچێتە هەندەران بە پەروەردەی ئیسلامی پەروەردە نـەكراوە، لەوێش چاوی كەس وكارو عەیبە نییـە، بگـرە بەشـێكی زۆر لـە گـەنجان بـۆ ئـەم مەبەستە كۆچ دەكەن.

٣. لەوەش خراپتر بە وتەی یەكێك لەو دۆستانەی كە لە بەلجیكا دەژیت دەڵێت، چەندین پێشانگای سێكسی پیاوان هەیە، پێی دەڵـێن (دیسـكۆ)، گەنجـەكانمان زۆر فێری كاری نێربازی بوون.

٤. زیناكردن و نێربازی لەم شوێنە گشتیانە چەندین نەخۆشـی لێ دەكەوێتـەوە، چونكە زۆربەیان هەڵگری جۆرەها ڤایرۆسن.

٥. زۆرێك لە گەنجەكانمان خاچ لە مل دەكەن ئەمە دروشمێكی گاورەكانە، ئەگەر پێی ڕازی بێ ئەوا بەم كارە كافر دەبێت، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ (المائدة:٥١) واتە: (ئەو كەسەی پشت بە ئەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانەو (حیسابی ئەوانی بۆ دەكرێت) بەڕاستی خودا هیدایەتی قەومی ستەمكار نادات). هەروەها خاچ واتە عیسا (سلامی خوای لێ بێت) لەخاچ دراوە ئەمەش قورئان بە درۆی دەخاتەوە، نابێت موسڵمان پێی ڕازی بێت، وەك ئەوەی خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴾ (النساء:١٥٧) واتە: (كەچی لەڕاستیدا نەكوشتوویانەو نە لە قەنارەو خاچیان داوە، بەڵكو لێیان تێكچووەو (كەسێكی تریان كوشتووە لەبری ئەو)، بەڕاستی ئەوانەی كە بیروبۆچوونی جیاوازیان لەو كێشەیەدا هەیە، خۆشیان لە گوماندان تیایدا و ئەوانە هیچ زانستیەكی ڕاستیان نییە لەو بارەیەوە، جگە لە شوێنكەوتنی

گومان نەبێت و بەدڵنیاییەوە (دەڵێین) کە نەیانکوشتووەو بۆیان نەکوژراوە).

٦. خۆچواندنی گەنجەکانمان بەکافران و هاوبەش پەیداکاران، ئەمەشی زۆر ترسناکەو نەرێنییە، موسڵمان دەبێ بە ڕەوشت و بیروباوەڕو خواپەرستی لە کافران جیاواز بێ، سۆزو خۆشەویستی بۆ خوداو پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانان بێت، نابێت بەدوای هەواو هەوەسی کافران بکەوێ، خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ﴾(المائدة:٤٩) واتە: (شوێنی ئارەزوەکانی ئەوان مەکەوە، وریابە نەوەکو ئەوان ڕێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێك لەو ڕێنموویيانەی کە خودا بۆی ناردوویت). وەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لیس منا من تشبه بغیرنا ولا تشبهو بالیهود ولا نصاری))[1]، واتە: لەئێمە نییە کەسێك خۆی بەبێجگەلە ئێمە بچوێنی، خۆتان بە یەهودی و گاورەکان مەچوێنن، هەروەها دەفەرموێت: ((من تشبه بقوم فهوه منهم))[2]، واتە: هەر کەسێك خۆی بە گەلێك بچوێنێ ئەوە لەوانە.

٧. لەئەنجامی تێکەڵ بوونی زۆر، خۆشەویستی و ئینتما بۆ کافرانی لادروست دەبێت، ئەمەش دروست نییە. موسڵمان لەسەری (واجبە) خۆشەویستی و ئینتما تەنها بۆ خوداو پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانان بێت. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِى سَبِيلِى وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ ﴾ (الممتحنة:١) واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەن بە دۆستی گیانی بەگیانی،

---

[1]. حديث حسن رواه الترمذي

[2]. رواه احمد

لەکاتێکدا خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەردەبڕن، بەڕاستی ئەوان بێ باوەڕیش بوون بەوەی لەلایەن خوداوە بۆتان هاتووە، ئەوانە پێغەمبەرو ئێوەش دەردەکەن لە مەککە، لەبەر ئەوەی کە باوەڕدەهێنن بەخودای پەروەردگارتان، (ئەمەم بەگوێ بکەن) ئەگەر ئێوە دەرچوون بۆ تێکۆشان لەپێناوی من و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی مندا، بەنهێنی خۆشەویستی خۆتانیان پێ دەگەیێنن، وەهەروەها خودای گەورە دەفەرموویێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (المائدة:٥١)، واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، جوولەکەو گاور مەکەن بە یارویاوەر و پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بە ئەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانەو (حیسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی خودا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات).

خودای گەورە بە خۆی (بەرائەتی) لەکافرو هاوبەش پەیداکاران کردووە دەبێ موسڵمانانیش (بەرائەتیان) لێ بکەن وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۙ وَرَسُولُهُۥ ﴾(التوبة:٣) واتە: (ئەمەش بانگەوازو ڕاگەیاندنێکە لەلایەن خودا و پێغەمبەرەکەیەوە بۆ هەموو خەڵکی، لە ڕۆژی حەجی گەورەدا کە: بەڕاستی خوداو پێغەمبەرەکەی بەریین لە موشریك و هاوەڵگەران). لە هەمان کاتدا موسڵمان لەسەری (واجبە) خۆی لە هەموو کارێك بپارێزێ کە خوداو پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕازی نین، با ئەو کردەوە کوفریش نەبێت، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴾ (الحجرات:٧) واتە: (بەڵام خودا ئیمان و باوەڕی لەلا خۆشەویست کردوون و لە دڵ

دەرونتاندا ڕازاندوویەتیەوە. لەو لایشەوە کوفرو بێ باوەڕی و گوناھ و یاخی بوون لە فەرمانی خودای لا تاڵ کردوون، ئا ئەوانە ھەر خۆیان ڕێگـەی ژیـری و سـەرفرازیان گرتۆتەبەر.

لەم بەڵگانە بۆمان دەرکەوت دەبـێ موسـڵمان لای خۆشەویسـتی تـەنھا بـۆ خوداو پێغەمبەر وباوەڕداران بێت، وەك خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ﴾ (المائـدة:٥٥) واتـــە: (بەڕاستی تەنھا خۆشەویسـت و پشـتیوانی ئێـوە، ھـەر خـوداو پێغەمبەرەکـەی و ئەوانەن باوەڕیان ھێناوە، کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و زەکات لە مـاڵ و سامانیان دەردەکەن و ھەمیشە لە کرنوشبەرانن.

٨. لەدەست دانی خێزان ومنداڵ، لە ولاَتی کافراندا ئازادیەکی ڕەھا و بێ سنور ھەیە، بۆتە مایەی ئەوەی ڕێزو دەسەلاَتی تاکەکان وەك خۆی نەمێنێ، بەھۆی ئـەم بەناو ئازادیە باوك بۆی نییە ڕێ لە منداڵەکـەی بگـرێ و لـێ پێچـینەوەی لەگـەڵ بکات، مێرد بۆی نییە لـێ پێچـینەوە لەگـەڵ ھاوسـەرەکەی خـۆی بکـات، ھـەر ئازادیەکیش ڕەھا بێ ئەوا خراپەی لێ دەکەوێتەوە. ئەگەر کەشتی لەناو دەریـا بـێ لەنگەر نەگرێ بەریەك دەکەون، ئەستێرەکان لەناو دەچن فڕۆکە بـەو شـوێنەی بـۆی دانراوە بەو ڕێگەیە نەڕوات، کارەسات ڕوودەدات، بەھەمان شێوە ژیـانی خێـزانیش ھەر کەس بەدەسەلاَتی خۆی ھەڵنەستێ ئەوا کارەساتی لێ دەکەوێتەوە.

### بەسەرھاتێکی ڕاستەقینە لەسەر ئەم کارە:

ژن و پیاوێك بەرەو ھەندەران ڕۆیشتن تا لە ولاَتی ئەڵمانیا جێگیربـوون، دوای کەمێك مانەوە لەم ولاَتە پیاوەکە ڕۆژانە دەچووە مەلەوانگەیەك مەلـەوانی دەکـرد

ئەم مەلەوانگەیە تێکەڵ بوو، هەموو ڕۆژێك كە دەهاتەوە خێزانەكەی لێی دەپرسی لە كوێ بووی؟ دەیگوت لە مەلەوانگە بووم ڕۆژێك هاتەوە خێزانەكەی لەماڵ نەبوو، دوای كە هاتەوە پێی گوت لەكوێ بووی؟ گووتی چووم بۆ مەلەوانگە، گوتی بۆچی چووی؟ گوتی وەكو تۆ، ئەی بۆ تۆ دەچیت منیش ئازادم، پیاوەكە گوتی قەبوڵ ناكەم، ئافرەتەكە گوتی لە دادگا سكاڵات لەسەر تۆمار دەكەم، دواتر لەسەر ئەم گرفتە تەڵاقیدا. پیاوەكە گەڕایەوە بۆ كوردستان، ئافرەتەكە لەدادگا منداڵەكانیشی لێ سەندەوە، ئێستا بەتەنیا لەگەڵ منداڵەكانی لە ئەڵمانیا دەژی، كەواتە بەهۆی ئەم ئازادیە خێزان و منداڵەكانیشی لەدەست دا.

٩. لەدەست دانی پەروەردەی ئیسلامی بۆ منداڵەكان، هەر ئەم بەناو ئازادییە بێ سنورە وای كردووە منداڵان لەسەر پەروەردەی ئیسلامی گەورە نەكرێن، لە هەڵسوكەوت ئازادبن، ڕۆژانە لە قوتابخانەكان مامۆستایان داوا لەكوڕو كچان دەكەن ئەگەر دایكتان یان باوكتان ڕێی لێ گرتن ئێوە ئاگاداری ئێمە بكەنەوە تا بەتوندترین شێوە لەدادگا سزایان بدەین، ئەو كاتە زۆر ترسناكە بەتایبەتی لەسەر كچان، زۆرێك لەوانەی لە ئەوروپا دەژین كچەكانیان لەدەست داوە ئێستاش كار لەكارترازاوە بەناچاری (تەسلیمی) ئەم ڕاستەقینەیە بوون.

١٠. ناتوانی فەرمان بەچاكە و ڕێگری لەخراپە بكەی، برای گەنجم یەكێك لە ڕەوشتە بەرزو كردەوە جوانەكانی ئومەتی موحەممەد (ﷺ) پێی وەسف كراوە فەرمان بەچاكە و ڕێگرییە لەخراپە،﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾

١١. ئامادەبوون لە ئاهەنگەکانی کافران، یەکێکی تر لەو کارە ناشەرعی و نەرێنیانەی تووشی گەنجانی موسڵمان دەبن لە وڵاتی کافران ئامادەبوونە لەئاهەنگی کافران ئەمەش دروست نییە و هاوکاری کردنی کافرانە، خودای گەورە هاوکاری کردنی کافرانی قەدەغە کردووە وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ (المائدة:٢) واتە: (نەکەن یارمەتی و کۆمەکی یەکتر بکەن لەسەر گوناه و دەست درێژی، لە خودا بترسن و پارێزکار بن، چونکە بەڕاستی خودا زۆر بەتوندی تۆڵە دەسێنێت).

١٢. گەنج دەکەوێتە گومان و دوودڵی لەئایینەکەی.

١٣. گەنج سەرسوڕماو دەبێ بە شارستانیەتی کافران وە لەبەرامبەردا شارستانیەتی ئیسلامی لەبەرچاو نزم و لاواز دەبێ.

١٤. هەڵسوکەوت و ئادابی کافران پەیڕەو دەکات وکاریگەری پەروەردەی ئیسلامی لەسەر کەم دەبێتەوە.

١٥. ژیان بردنە سەر لەکاتی بێ شوێنی لەماڵێکی کافراندا و خزمەت کردنی کافران ئەمەش دەبێتە مایەی زەلیلی بۆ موسڵمانان.

١٦. کارکردن لەشوێنی بەدڕەوشت و شوێنی مەی خواردنەوە و شوێنی دروست کردنی شتی خراپ بێ سودو بێ شەرعی، ئەمەش هاوکاری خراپەیەو حەرامە.

١٧. هێنانی ژن لە کافران ئەمەش زیان بەڕەوشت و بیروباوەڕی خۆت و منداڵەکانت دەگەیەنێ.

١٨. دوورکەوتنەوە لەکەس وکارو دایك و باوك.

١٩. لەکاتی گەڕانەوەی کار لەسەر تێکدانی کۆمەڵێك گەنجی تر دەکات ئەوانیش بە وشەی درەوشاوە سەرلێ شێواو دەکات.

٢٠. لەكاتی ڕۆیشتنی زۆربەی گەنجان كار لە ئابووری وڵاتی موسڵمانان دەكات و ئابووری وڵاتی كافران بەهێز دەكات، چونكە گەنج سەرچاوەی داهاتی وڵاتە.

٢١. لەكاتی كۆچ كردنی زۆرینەی گەنجان، كچانێكی زۆر دەمێننەوەو كەس نایانخوازێ، ئەمەش زەرەر بەموسڵمانان دەگەیەنێ بەگشتی.

٢٢. (سیلەی ڕەحم) لەدەست دەدات، لەهەموو كەس وكاری دوورە، ئەمەش ڕەوشتی موسڵمان نییە واز لە دایك و باوك و كەس و كاری بهێنێ.

٢٣. زۆرجار لەشوێنێك كاردەكەن خاوەن كارەكە ڕێگایان پێ نادات بچن بۆ وتاری هەینی، جاری واهەیە ناهێڵێ نوێژیش بكەن ئەمەش زۆر ترسناكە بۆ ئایینەكەی.

٢٤. جگە لەمانە زەرەرێكی زۆر گەورەیە بۆ دوارۆژی، زۆر لەوانەی دەڕۆن لە ڕێگا دەكەونە ناو دەریا یان دەكوژرێن یان لەناو بەفر گیان لەدەست دەدەن، كاتێك لەبەر دەستی خودا ڕادەوەستن چۆن وەڵامی دەدەنەوە، دەڵێن ئەی خودایە بۆچی سەفەرمان كرد بۆ ناو كافران و مەی خواردنەوەو تێكەڵی ئافرەت و داوێن پیسی كە ئەم وەڵامانەی مایەی سەرشۆڕی و شەرمەزاریە لەڕۆژی دوایی.

٢٥. ئەو نەوەی دوای ئەوانە پەیدادەبێت كە لە ئەوروپا گەورە دەبن نقوم دەبن لەناو مەی خواردنەوەو ڕابواردن و ئافرەت و ماددەی سڕكەر.

٢٦. هیچ شتێك لە ئایینەكەی خۆیان نازانن كە ئیسلامە، ئەوەی ناوی (موحەممەد)ە دەیكەنە مایكل، ئیبراهیم دەبێتە بۆب.

٢٧. هەر دایك و باوكێك سزای منداڵەكەی بدات ئەوا بەندیخانە چاوەڕێی باوك و دایك دەكات، چونكە زۆربەی منداڵەكان وافێركراون ئەگەر دایك و باوك سزایان

بدەن هەڵسن لە بنکەی پۆلیس و دادگا سکالاً بکەن!

٢٨. ئەگەر دایك وباوك مردن بە هەر هۆکارێك، نوسینگەی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی منداڵەکان دەبات و دەیداتە دەستی خێزانێکی ناموسڵمان تاپەروەردەی بکات یان خانەی بێ سەرپەرشتان کە زۆربەیان لەلایەن کلێساوە بەڕێوەدەبرێن.

٢٩. بەشێکی زۆری کچان شوو بە پیاوی گاور دەکەن، ئەم ڕوداوە یەکجار زۆرە، ئەمە زەلیلیە بۆ موسڵمانان. ئەم خالآنە چەند خالێکی ڕاستەقینەن هەموو ڕوویان داوە هەربۆیە باسمان کرد، ئەگینا خاڵی یەکجار زۆر ماون!

**سوود و قازانجی کۆچ کردن بۆ ولآتی کافران:**

گومانی تێدا نییە زۆربەی شتەکان دوو لایەنەن لایەنی چاك و لایەنی خراپەیان هەیە، کۆچ کردن بۆ ولآتی کافران ترسناکی وخراپەی زۆرترە لەچاکەو سوودەکەی! بەلآم لەگەڵ ئەوەش هەندێ سوودی هەیە لەوانە.

١. فێربوونی زمانی بێگانە، ئەمەش سوودی هەیە وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: ((من علم لغة قوم يأمن مكرهم)). واتە: هەر کەسێك زوبانی گەلێکی تر بزانێت لە شەڕیان ئەمین دەبێت.

٢. بازرگانی کردن بۆ مەبەستی جێ بەجێکردنی پێداویستیەکانی موسڵمانان.

٣. کارکردن و پەیداکردنی بژێوی ژیان، لەکاتێك کە ولآتی موسڵمانان کارکردن کەم بێ یان دەست نەکەوێ.

٤. فێربوون وخوێندن لەو خوێندنگایانەی کەلە ولآتی موسڵمانان نییە.

٥. شارەزا بوون لە داب و نەریتی بت پەرستی و شتە خراپەکانیان تا ئیسلامی

لەلا بەرێز و ئازیزتر بێت.

٦. فێربوونی هەندێك زانستی پیشەسازی و كشتوكاڵی وپیشەوەریەكانی تر كـە موسڵمانان پێویستیان پێیە.

٧. هەندێ جار وڵاتی كافران دەبێتە پەناگەیـەك بـۆ ئـەو كەسـانەی لـە وڵاتـی خۆیان ژیانیان كەوتۆتە مەترسی و ناتوانن ژیانی ئاسایی خۆیان بەسەر ببەن.

٨. كردنەوەی نوسـینگە و قونسـوڵخانە بـۆ پەیوەنـدی بەسـتن لەگـەڵ وڵاتـانی بێگانە.

٩. چارەسەری ئەو نەخۆشانەی كەلە وڵاتی خۆت بۆت چارەسەر ناكرێت.

١٠. گەیاندنی بانگەوازی ئیسلامی بە وڵاتانی دونیا و بەستنی كۆڕو سـیمینار بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو شك وگومانانـەی كـە بەناهـەق بـۆ ئیسـلامیان دروسـت كردووە.

حوكمی كۆچ كردنی حەرام:

**١. كۆچ كردن بەمەبەستی مانەوە (الاقامە) لەناو كافران**

**٢. كۆچ كردن بە مەبەستی گەشت وگوزار**

**١. كۆچ كردن بەمەبەستی مانەوە (الاقامە) لەناو كافران**

حوكمی مانەوەو جێنیشین بوون (الاقامە) لەوڵاتی كافران:

مانەوەو جێنیشین بوون لەوڵاتی كافران زۆر ترسناكەو گاریگەری زۆری لەسەر گەنجان جێ هێشتووە، بۆیە زانای پایەبەرز شێخ ئیبن عثیمین چەند مەرجێكی داناوە بۆ مانەوە لەناو كافران كە ئەمانەن:

**الشرط الاول:** أمن المقيم على دينه، بحيث يكون عنده من العلم والايمان وقوة العزيمة مايطمئنة على الثبات على الدينه والحذر من الانحراف وان يكون مصدراً لعداوة الكافرين وبغضهم مبتعداً عن محبتهم ومحبتهم مما ينافي الإيمان. واتە: مەرجی یەكەم: كەسی جێنیشین بوو لەناو كافران دەبێ ئەمین بێ لە ئایینەكەی، بەشێوەیەك خاوەنی زانست و باوەڕێكی بەهێز بێ، بتوانی لەسەر ئایینەكەی بمێنێتەوە، لانەداو كافران خۆشنەوێت، دووركەوێتەوە لەخۆشویستنی كافران و پشت بەستنیان بە ئەوان. وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: ((من احَبَّ قوماً فهو منهم)) الطبرانى فى الكبير واتە: كەسێك قەومێكی خۆش بوویێت لەوانە. (المرءُ معَ مَنْ

احبَّ)[1] خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ (المجادلة:٢٢) واتە: (کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە خوداو بە ڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بووێت کە دژایەتی خوداو پێغەمبەرەکەیان کردبێت، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باووباپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن. هەروەها دەفەرموویێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ (المائدة:٥١) واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جوولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بە ئەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانەو (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی خودا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات).

**الشرط الثاني:** ان يتمكن من اظهار دين، بحيث يقوم بشعائر الاسلام بدون ممانع، فلا يمنع من إقامة الصلاة والجمعة والجماعات ان كان معه من يصلى جماعة ومن يقيم الجمعة ولاينفع من الزكاة والصيام والحج وغيرها من شعائر الدين فان كان لايتمكن من ذلك لم تجز الاقامة لوجوب الهجرة حينئذٍ.

واتە: مەرجی دووەم: دەبێ بتوانی ئاینی خۆی دەربخات، بەشێوەیەك دروشمەكانی ئیسلام بەرپا بكات بەبێ قەدەغەكردن، لەبەرپا كردنی نوێژی هەینی و نوێژی بەكۆمەڵ قەدەغە نەكرێت، لە زەكات، ڕۆژو و حەج ودروشمەكانی تر قەدەغە نەكرێت، ئەگەر هاتوو نەیتوانی ئەوانە جێ بەجێ بكا، دروست نییە لەو وڵاتە

[1]. البخاري ومسلم

بمێنێتەوەو هەروەها ئیبن عثیمین دەفەرموێت: (جار فی الحدیث عـن النبـی (ﷺ) من الجامع المُشترکَ وسَکَنَ مَعَهُ فانهُ مِثلُه)[1]

واتە: (هـەر کەسـێك لەگـەڵ هاوبـەش پەیـداکاران کۆبێتـەوەو نیشـتەجێ بـێ لەگەڵیان ئەوە لەوانە) هەروەها دەفەرموێت: (عن قیس بن أبی حازم عن جریـر بـن عبدالله رضی الله عنه ان النبی (ﷺ) قال (أنا بريءٌ مِنْ کُلِّ مسلم یقیم بین أَظهُـر المشریکین قالوا یارسول الله ولِمَ؟ قال لآتَرَ اتری نارَاهُما)[2] واتە: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی مـن بەریمـە لەهـەموو موسـڵمانێك نیشـتەجێ بێـت لـەنێوان هاوبـەش پەیداکاران، گوتیان لەبەرچی ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی نابینن ئەوان ئەهلی ئاگرن) لە کۆتایی قسەکانیدا شێخ عثیمین دەفەرمووێت: وکیف تطیب نفس مؤمن أن یسکن في بلاد کفار تعلق فیها شعائر الکفر ویکون الحکم فیهـا لغیر الله ورسوله وهو یشاهد ذلك بعینة وسیسمعه بأذنیه ویرضـی بـه؟! بـل یفـتس الی تلـك البلاد ویسکن فیها بأهله وأولاده ویطمئن إلیها کی یطمـئن الی بـلاد المسـلمین مـع ما فی ذلك من الخطر العظیم علیه وعلی اهله واولاده فی دینهم وأخلاقهم.

واتە: (چۆن دەرونی مرۆڤێکی باوەڕدار پاك دەبێتەوە لەوڵاتی کـافران نیشـتە جێ بێت، ئەم وڵاتەش دروشمەکانی کوفر ڕابگەیێنێ وحوکم بەبێجگەلـە بەرنامـەی خوداو پێغەمبەر (ﷺ) بکات ئەم موسڵمانەش بەچاو ببینی و بەگوێ گـوێی لێ بگرێ وپێشی ڕازی بێت؟! بەڵکو خۆی بداتە پاڵ ئەم وڵاتە و بەخۆی ماڵ ومنـداڵی لەم وڵاتە نیشتەجێ بێت و تیایدا ئارام بگرێت وەك ئـەوەی لـە وڵاتـی موسـڵمانان ئارامی گرتبێ، لەگـەڵ ئـەوەی وڵاتـی کـافران ترسـناکیەکی زۆر گـەورەی لەسـەر ڕەوشت وئایینی خۆی وماڵ و منداڵەکەی هەیە). (مجموع فتـاوی ورسـائل)ی شـێخ ئیبن عثمین.

---

[1]. ابو داود وصحه الالبانی فی صحیح سنن ابی داود

[2]. رواه ابو داود والترمذی

## ٢. كۆچ كردن بە مەبەستی گەشت وگوزار

بەشێك لەموسڵمانان گەشت دەكەن بۆ وڵاتی كافران بەمەبەستی گەشت وگوزار كردن، زانایان بۆ ئەم مەبەستە چەند مەرجێكیان داناوە بۆ كەسێك كە گەشت بكات، بۆ ئەم مەبەستە لەوانە:

دەڵێن: السفر الى بلاد الكفار لايجوز الا بثلاثة شروط:

الشرط الاول: ان يكون عند الانسان علم يدفع به الشبهات.

الشرط الثانی: ان يكون عنده دين يمنعه من الشهوات.

الشرط الثالث: ان يكون محتاجاً الى ذالك.

واتە:

**مەرجی یەكەم:** دەبێ كەسەكە زانستێكی وای هەبێ بەرپەچی گومان و گومڕایی بداتەوە.

**مەرجی دووەم:** دەبێ كەسەكە ئایینێكی وای هەبێ لە هەوسبازی بی پارێزێ.

**مەرجی سێ یەم:** پێویستی بەم گەشتە هەبێ.

زانایان دەڵێن، ئەگەر ئەم مەرجانەی لێ نەهاتە دی، ئەوا حەرامە، دروست نییە گەشت بكات، چونكە فیتنەی بۆ ئایینی دروست دەبێ و ئەم زەرەرو زیانانەی كە باسمان كرد لەپێشدا تووشی دەبێت.

ئەگەر بۆ گەشت وگوزاریش بچن، زانایان دەفەرموون با گەشت وگوزار بكات

بۆ وڵاتی موسڵمانان لەوێ دروشمە ئایینیەکان هەیە و ئەمینیشە لە تووشبون بەفیتنە.

وە ئەم پرسیارەیان لە لیژنەی هەمیشەیی کرد بەم شێوەیە وەڵامی داوەتەوە.

ج/ لايجوز السفر لبلاد اهل الشرك الا لسوغ شرعی وليس قصد الفسعة مسوغاً للسفر لقول النبي (ﷺ) (أنا بريٌ مِن كُلِّ مسلمٍ يُقيمُ بين اظهُرِ المشركين)[1]، ولذلك ننصحك بعدم الذهاب لتلك البلاد ونحوها للفرض المذكور لما في ذلك من التعرض للفتن.

واتە: گەشت کردن بۆ وڵاتی کافران دروست نییە، تەنها بە مەبەستی شەرعی نەبێ، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (من بەریمە لە هەموو موسڵمانێك نیشتەجێ بێ لەناو وڵاتی هاوبەش پەیداکاران) لەبەر ئەوە ئامۆژگاریتان دەکەم گەشت نەکەن بۆ وڵاتی کافران بۆ ئەم مەبەستەی باسمان کرد، (چونکە فیتنەی تێدایەو لەوانەیە تووشی بین). (فتاوی (الجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء) ڕای شێخ موحەممەد ساڵح ئەلمونجەد دەربارەی گەشت بۆ وڵاتی کافران بەمەبەستی گەشت وگوزار فەرمووی: ((البلاد الاسلامية التی تحكم بالشريعة الاسلامية يجوز السفر اليها ان خلت من المنكرات والفواحش والبلاد التی اهلها مسلمون ولاتحكم بالشريعة الاسلامية فهوه لايسافر اليها من اجل السياحة و اولی بالتحريم البلاد التی اهلی الكافرون ولايجوز السفر الی هذه البلاد الی للمظطر كمريض مسافر للصلاح او صاحب غرض صحيح كذا هب التجارة اودعوة.

واتە: (ئەو وڵاتەی حوکم بە شەریعەتی ئیسلام دەکات دروستە گەشت بکەی بۆ ئەم وڵاتە، ئەگەر خراپە و بەدڕەوشتی تێدا نەبوو، بەڵام ئەو وڵاتەی خەڵکەکەی

[1]. رواه ابوداود

موسڵمانە وحوکم بەشەرعی خودا ناکات نابێ بۆ مەبەستی گەشت وگـوزار گەشـت بکەیت بۆ ئەم وڵات، کەوایە ئەولاترە گەشت بۆ وڵاتێك کە خەڵکەکە کافر بن ئـەوا هەر حەرامە، نابێ بۆ ئەم وڵاتانە گەشت بکەیت، تـەنها بـۆ مەبەسـتی پێویسـتی وەك نەخۆش بۆ چارەسەر یان بازرگان یان بانگخوازی).

ڕای شێخ ساڵح فەوزان: السـفر الی بـلاد الکفـر لایجـوز لأن فیـه مخـاطر علـی العقیدة والاخلاق ومخالطة للکفار واقامة بین اظهـرهم، امـا السـفر للسـیاحة لایجـوز لأن المسلم لیس بحاجة الی ذلك ولایعود علیه منه مصلحة تعادل او تراجع علی مـا فیه من مضرة وخطر علی الدین والعقیدة.

واتە: (گەشت کردن بۆ وڵاتی کافران دروست نییە، چونکە مەترسی تێدایە بـۆ سەر بیروباوەر و ڕەوشت و تێکەڵاوی کافران و نیشتەجێ بوون لـەنێوان کـافران، وە گەشت کردن بەمەبەستی گەشت وگـوزار ئـەوە دروسـت نییـە، چـونکە موسـڵمان پێویستی پێ نییـە، هـیچ بەرژەوەندیـەکیش بـۆ ئـەو ناگەڕێتـەوە لەگـەڵ ئـەوەش مەترسی و زەرەرو زیانی زۆری هەیە بۆ سەر ئایین و بیروباوەڕی موسڵمانان).

**لە کۆتاییدا چیمان بۆدەرکەوت:**

پوختەی قسان ئەم کۆچ کردنانەی کە حەرامە لەپێشدا بۆمان دەرکـەوت ئـەم چەند خاڵەش بەکورت و پوختی باس دەکەین نەوەکو لەپێشدا بۆمان وەدەرنەکـەوت بێت.

١. کۆچ کردن حەرامە بۆ وڵاتی کافران بۆ کەسێك کە باوەڕەکەی بێ هێزو لاواز بێت نەتوانێ بەرەنگاری گومان و هەوەسبازی ببێتەوە بەتایبەتی گەنجەکان.

٢. كۆچ كردن حەرامە بۆ وڵاتی كافران بـۆ كەسـێك كـە لـەو وڵاتـە هاوكـاری كافران بكات و بەهێزیان بكات لەدژی موسڵمانان.

٣. بۆ ئەو كەسانەش حەرامە كۆچ بكەن بۆ وڵاتی كـافران كـە خـاوەنی پیشـەو توانستی تایبەتین وەك شارەزایی لەزانستی (زەرەو نەوەوی) و شتی تر. بچن لـەوێ خزمەتی كـافران بكـەن ودژی موسـڵمانان بـەكاری بهێـنن، وەكـو خـودای گـەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ﴾ (المائـدة:٢) واتە: (نەكەن یارمـەتی و كۆمەكی یەكتر بكەن لەسەر گوناه و دەست درێژی).

## سێ یەم: كۆچ كردنی ناپەسەند (مكروه):

١. كۆچ كردن ناپەسەندە، بۆ كەسێك ترسێكی كەمی هەبێ لە ئایینی خۆی یان ڕەوشتی یان خێزانەكەی كوفر كاریان تێ بكات، بەڵام ئەگەر ترسەكە بەهێزبوو واتە تەواو ئەمین نەبوو لەوەی كە ئایینیان سەلامەت دەبێت ئەوا ئەو كات كـۆچ كـردن حەرامە و نابێ بۆ وڵاتی كافران كۆچ بكات، لەبەر ئەم هۆیـە هەنـدێك لـە زانایـان گەشت كردنیان بۆ بازرگانی لەوڵاتی كافران بە ناپەسەند داناوە بەتایبـەتی ئەگـەر كەسەكە بە تەنها بوو، چونكە شەیتان لە كەسـێكی بەتـەنها نـزیكترە تـاوەكو لـە كۆمەڵێك دابن ڕشید دەڵێ: (كره مالك رحمه الله الخروج الى بلاد الحرب للتجارة فـى البر والبحر كراهة شـديدة)[1] واتە( ئیمامی مالك بـە ناپەسـەندی دانـاوە گەشـت كردن بۆ ولاتی كافران بۆ بازرگانی لەرێی وشـكانی یـان دەریـا بـە ناپەسـەندێكی بەهێز). ئەمەش هۆكارەكەی ڕوون كردۆتەوە لەبەر ئەوەی نـەوەك لەسـنوری وڵاتـی كافراندا بكەوێتە ژێر كاریگەری یاسای ئەم وڵاتە.

[1]. المقدمات ج٣/٣٤٥

٢ . كۆچ كردن بۆ ولاَتی كـافران بـە نیـازی هاوسـەرگیری لـە (ئـەهلی كتـاب) ناپەسەندە. چونكە ترسی ئـەوەی لیَ دەكرێـت منـداڵیان لـەژێر كاریگـەری و ئـەم ژینگەیەی لێی دەژی ناموسڵمان دەربچیَ و لەسەر بیروباوەری ئـەوان گـەورە ببێـت ئەمەش ناپەسەندەو كار لەوەچەی موسڵمان دەكات.

**چوارەم: كۆچ كردنی سونەت (المستحب):**

١ . كۆچ كردن بۆ كەسێك سونەتە بۆ ولاَتی كافران ئەگەر ئـەو كەسـە توێشـوی گەشت كردنی هەبیَ و بۆی بگونجیَ دروشمەكانی ئیسلام ڕابگەیـەنیَ، ئەمـەش لـەم ولاَتانـە دەكرێـت كـە یاسـایەكی ئـازادی ڕادەربـڕین هەیـە، بـۆ هـەموو خـاوەن بیروباوەڕێك هەیە بانگەشە بـۆ بیروبـاوەڕی خـۆی بكـات و ڕێـز لەهـەموو ئایینـە جیاوازەكان بگرێت. لەو كاتەدا هەندێك لە زانایان پێیان وایە كـۆچ كـردن بـۆ ئـەم شـوێنە خێـرە بـۆ زیـادكردنی موسـڵمانان و گەیانـدنی ئیسـلام وپشـتگیری ئـەو موسڵمانانەی لەوێن[1].

٢ . كەسێك لە ولاَتی كافران بیَ و لە ئایین و ژین نەترسیَ لەبـەر ئـەوەی مـاڵی زۆرە یان خاوەنی هۆزێكی زۆرە ئەوە سـونەتە لـەم ولاَتـە بمێنێتـەوە وەك ئیمـامی ماوەردی دەفەرمووێت: (والموسلمون فیها رای فی الهجرة علـی ثلاثـة اقسـام احـدها من كان منهم فی سعة من مال وعشیرة، لایخاف علی نفسه ولاعلی دینه كالعبـاس عـبدالمطلب فالهجرة فی حقه مـندوبة). لقـول التعـالی: ﴿وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ (النساء:١٠٠) واتە: (دەربارەی كۆچ كردنی موسڵمانان دەبێتە سیَ بەش، یەكەمیان، كەسێك خاوەن ماڵ و هۆز بێت لـە

---

[1]. فتح الباری ج٦ ص٢٢٠

گیان و لە ئایینی نەترسێ وەك عەباسی كوڕی عەبدولموتەلیب ئەوكاتە كۆچ بۆ ئەو سونەتە لێرەدا قسەی ئیمامی ماوەردی لەگەڵ ئەوەی تایبەت بە حوكمی كۆچ كردنی موسڵمانانە لە مەككەوە بۆ مەدینە، بەلاّم حوكمەكەی بەگشتی و ئەم كەسانەش دەگرێتەوە كەلە (داری شرك) دادەژین.

٣. كۆچ كردن بۆ وڵاتی موسڵمانان سونەتە بۆ كەسێك لە ئایین و ماڵ و گیانی دڵنیا بێ و بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان كۆچ بكات، وەك بانگخوازی بۆ ئیسلام بكات و وانەی پەروەردەی ئیسلامی و زانستی ئیسلامی لە قوتابخانەكان بڵێتەوەو بەرپەرچی گومان و خراپەكانیان بداتەوە و هەق و ڕاستی ئیسلامیان بۆ ڕوون بكاتەوە. لەفەتوای لێژنەی هەمیشەیی سعودی لەو بارەیەوە دەڵێن: (وما قدر على اظهار دينه فلا تجب عليه الهجرة بل هي مستحبة أي الى دار الا سلام —وقد لا تستحب اذا كان فى بقائه بين اظهر هم مصلحة دينية من دعوة الى التوحيد والسنة، وتحذير من الشرك والبدعة علاوة على اظهار دينه)[1] واته: (بەلاّم كەسێك توانای هەبێت ئایینەكەی دەربخات (واجب) نییە لەسەری كۆچ بكات، بەڵكو سونەتە كۆچ بكات بۆ وڵاتی داری ئیسلام، وەجاری واهەیە سونەت نییە ئەگەر هاتوو مانەوەی لە وڵاتی كافران بەرژەوەندیەكی ئایینی تێدا بێت بانگەشەی یەكتاپەرستی و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) بكەی، وە خەڵك ئاگادار بكەینەوە لە هاوبەش دانان و نوێگەرایی (بیدعە) و، وێرانی دەرخستنی ئایینەكەی).

## پێنجەم: كۆچ كردنی حەڵاڵ (موباح):

١. دروستە بۆ كەسێك لە وڵاتی كافران بێ و نەتوانێ ئایینی خۆشی ڕابگەیەنێ هەر لەوێ بمێنێتەوە، بەمەرجێك یەكێك لەم (عوزرە) شەرعیانەی هەبێت، وەك

[1]. مجلة البحوث الاسلامیه ص٦١ عدد٦٠

نەتوانێ کۆچ بکات لەبەر هەژاری یان نەخۆشی، یان پیری، یان دیلی، یان نەبوونی توێشوی گەشت هەڵگر، ئەم چوارانە (عوزری) شەرعیان هەیە و لەسەریان (واجب) نییە کۆچ بکەن و دروستە لە وڵاتی کافران بمێنێنەوە تا (عوزرەکەی) لادەچێ. ئیبن قودامە دەفەرمووێت: (الثانی من لاهجرة علیه وهو من یعجز عنها اما المرض لە اکراه علی الاقامة او ضعف من النساء والولدان وشبهم فهذا لاهجرة علیه) قوله تعالی: ﴿ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴾(النساء:٩٨)[1] واتە: (جۆری دووەم لە کۆچ کردن کە کۆچی لەسەر نییە ئەو کەسەیە کە توانای نییە یان لەبەر نەخۆشی یان بەزۆر لەم شوێنە ماوەتەوە یان ئافرەت و منداڵ و وێنەی ئەوانەیە ئەوانە کۆچ کردنیان لەسەر نییە واتە: (مەگەر ئەوانەیان کە بەڕاستی بێ دەسەڵات و ناتەواون و لاوازکراون لەو پیاوانەی ژن و منداڵیان لەگەڵ دایەو ناتوانن چارەسەر و گۆڕانکاریەك بۆ خۆیان بکەن و هیچ ڕێگەیەکیش شارەزا نین بۆ چارەسەرو دەربازکردنی خۆیان). مانەوەی ئەوانە بەسونەت وەسف ناکرێ، چونکە لە توانای خۆیان نییە).

٢. هەروەها دروستە بۆ موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ وڵاتی کافران ئەگەر ئەو شوێنەی لێی دەژین لە سەریان تەسك کرایەوە بەهۆی بەلایەك یان ستەمیان لێ دەکرا و ئارام گرتنیش سودی نەبوو یان تووشی کوشتن و بڕین و هەژاریەك دەبوون، دەگەیشتە پلەی کافربوون. ئەوکات بەپێی کەسەکە دەگۆڕێت ئەگەر کەسەکە بانگخواز بوو یان زانا بوو ئەوا ئارام بگرێ باشترە، نەك کۆچ بکات، چونکە خەڵك پێویستیان پێیەتی و چاوی لێ دەکەن و بەم ئارام گرتنەش پاداشتی لە لای خودا بەبێ حیسابە، بەڵام بۆ ئەو کەسەی نەتوانێ ئارام لەسەر ئەم ناخۆشیانە بگرێ

[1]. ولا توصف باستجاب لانها غیر مقدور علیها) المغنی ج١٢ ص٦٨٠

دروستە و حەلاڵە كۆچ بكات بۆ وڵاتێكی تر كە تیایدا (امـین) بـێ، زانـای نـاودار بوطی دەفەرموێت: (أمـا الهجـرة مـن دار الا سـلام فحكمهـا بـين الوجـوب والجـواز والحرام واما الجواز فيكون عـندما يصيبة فيها بلاء يضـيق بـه ،فيجـوز لـه أن يخـرج منها الى دار اسلاميه اخرى)[1]. واتە: (كۆچ كردن لە (داری ئیسلام)، حوكمەكـەی لەنێوان (واجب) و دروسـت و حەرامدایـە، ئـەوەی دروسـتە ئەوەیـە كـە كەسـەكە تووشی بەلاٌیەك دەبێت شوێنەكەی لەسەر تەسك دەبێتەوە، ئەو كات بۆی هەیە لـە وڵات دەربچێت بۆ وڵاتێكی تر)

٣ . دروستە و حەلاڵە موسـڵمان بـۆ بازرگـانی كـردن و كـاركردن كـۆچ بكـات بەمەرجێك ئایینەكەی پارێزراو بێت، ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: قال أبو نعيم فى أحياء علوم فى الدين (رأيت سـفيان الثـورى وقـد جعـل جـراب علـى كتفـه، و أخـذ نعليه، فقلت الى أين يا أبا عبد الله؟ قال الى بلد أمـلأ فيـه جرابـى بـدرهم) واتـە: (ئەبو نـەعیم دەفـەرموێت: سـوفیانی سـەوریم بینـی تورەگەیـەكی لەسـەر شـانی دانابوو، نەعلەكانی بەدەسـتەوە بـوو پـێم گـووت: بـۆ كـوێ دەچـی ئـەی بـاوكی عەبدوڵلا؟ گـوتی: بـۆ وڵاتێـك تورەگەكـەم پڕكـەم لـە دەرهـەم). خـودای گـەورە دەفـــــــــــەرموێت: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً﴾( النساء:١٠٠) واتە: (جا ئەوەی كۆچ بكات لـەپێناوی خـودادا لـەو زەوییـەی كـە كۆچی بۆ دەكات، سەربەرزییەك بـۆ خـۆی و ڕیسـواییەكی زۆریـش بـۆ دوژمنـانی دروست دەكـات، بەرەكـەت و فراوانـی رزق و ڕۆزی ڕووی تـێ دەكـات. ئیمـامی زمەخشەری دەفەرموێت: (كل الهجرة لغرض الدينى من طلب علم او حـج او جهـاد او فرار الى البلد يزداد فيه طاعة او قناعة وزهدا فى الـدنيا او ابتغـاء رزق طيـب،

(١). قضايا فقهيه معاصرة للبوط

فهي هجرة الى الله ورسول وإن أدركه الموت في طريقة فأجره واقع على الله) كەشاف واتە: (هەموو كۆچ كردنێك بەمەبەستی ئایین بێت بۆ بەدەست هێنانی زانست بێت یان حەج كردن یان جیهادكردن یان ڕۆیشتن بۆ ولاّتێك خواپەرستیت زیاد بكات یان قەناعەت و دونیا نەویستیت زیاد بكات یان بۆ پەیداكردنی ڕۆزیێكی پاك بێت ئەوە كۆچ كردنە بۆ خوداو پێغەمبەر (ﷺ)، ئەگەر لەم ڕێگایەش مرد پاداشتەكەی دەكەوێتە سەر خودا). كەواتە دروستە مرۆڤ بۆ چارەسەری نەخۆشی و تەواوكردنی خوێندن و لێكۆڵینەوەو گەشت و گوزار گەشت بكات، بەم مەرجانەی كە باسمان كرد.

# لەکۆتاییدا:

دوای درێژەدان بە حوکم وجۆرەکانی کۆچ کردن بۆمان دەرکەوت کۆچ کردن حوکمی تایبەتی و جێگیری نییە، بەڵکو بەپێی کات و شوێن و کەسەکە دەگۆڕێت. باشترین پێوەریش بۆ مانەوەی مرۆڤ لەسەری و ژیان تێدا ئەم ووتەیە بەنرخەی شێخول ئیسلام (ئیبن تەیمیە) کە دەڵێت: (ولهذا كان أفضل الارض في حق كل انسان أرض يكون فيها اطواع لله ورسوله وهذا يختلف بأختلاف الآصوال ولاتتمين أرض يكون مقام إنسان فيها أفضل وإنما يكون الافضل في حق كل انسان فيها أفضل وإنما يكون الافضل في حق كل انسان بحسب التقوى والطاعة والخشوع والخضوع والمضور وقد كتب ابو درداء الى سلمان هلم الى الارض المقدسة فكتب اليه سلمان إن الارض لاتقدس أحداً وانما يقدس العبد عمله)[1] واتە: (لەبەرئەوە باشترین زەوی بۆ مرۆڤ زەویەکە گویڕایەڵی خودا و پێغەمبەری (ﷺ) تێدا بکرێ، ئەمەش بەپێی شوێن و بارودۆخەکان دەگۆڕێت وجیاوازە، ناتوانین شوێنیان دیاری بکەین کە تەنها ئەم شوێنە بۆ مرۆڤ چاکترە، بەڵکو چاکترین شوێن بۆ مرۆڤ ئەم شوێنەیە (تەقواداری)و گوێڕایەڵی و ملکەچی و لەخوا ترسانی هەبێت. ئەبو دەردا نامەی بۆ سەلمانی فارسی نووسی و فەرمووی، وەرە پەلەبکە بۆ زەوی پیرۆز، سەلمان نامەیەکی بۆ نووسییەوە فەرمووی، زەوی پیرۆز کەسی پێ پیرۆز ناکرێت، بەڵکو مرۆڤ بە کردەوەکەی پیرۆز دەبێت. هەروەها ئیبن تەیمیە لەدرێژەی قسەکانیدا دەفەرموویت، ئەگەر مزگەوتێك بکرێتە شوێنی خراپە و بەدڕەوشتی و هاوبەشی خودای لێ بڕیار بدرێت ئەم شوێنە پیرۆزی نامێنێت، بەهەمان شێوە ئەگەر

[1]. مجموع الفتاوى ج١٨ ص٢٨٣

شوێنێك قومار وخراپەكاری بگۆڕێت بە مزگەوت و خواپەرستی و ئـایین پـەروەری ئەوا پیرۆزی وەردەگرێت).

**لە كۆتاییدا:**

**گەنجی بەڕێز و خوشكی ڕێزدار، ئەم كتێبەی بەردەستت هەوڵ و كۆششی ١١ مانگە.**

لە ناخی دڵ و كاكڵی هزرم بۆم كۆكردیەوە، بـەپێی ئایـەت و فـەرموودەكانی پێغەمبـەر (ﷺ) و وتـەی زانایـانی بـەڕێز چارەسـەرمان بـۆ دانـاوە، خۆشـی و بەختەوەری من لەوەدایـە سـوود لـەم چارەسـەرانە وەرگریـت و دووركەوییـەوە لـە گرفتەكان، تاكە داوام لەلای تۆ دوعاییەكی خێرە لە شەوێكی بێ هەست و دڵێكـی پڕ باوەڕ و نزایەكی وەرگیراو.

لەكۆتاییدا دەڵێین:

﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾ (آل عمران:٨).

٢٠١٠/١/١٢

# سەرچاوەكان


١. قورئانی پیرۆز

٢. تەفسیری ئاسان

٣. تەفسیری (ابن كثیر)

٤. تەفسیر (الكبیر الرازي)

٥. صحیح البخاری

٦. صحیح مسلم

٧. همسة في اذن الشباب

٨. همسة في اذن الفتاة

٩. التفاهم في الحیاة الزوجیه

١٠. مراهقه بلا ارهاق

١١. الاسلام و الشباب

١٢. الدلیل التساهل للنجاح و السعادة

١٣. موسوعة الاسرة تحت رعایة الاسلام

١٤. فەرهەنگی دەریا

١٥. اسعد امراة في العالم

١٦. اصول المعاشرة الزوجیه

١٧. كيف تبنين بيتاً سعيداً

١٨. شباب بلا مشاكل

١٩. موسوعة الاخلاق الاسلاميه

٢٠. دور الشباب في حمل رسالة الاسلام

٢١. الشباب المسلم في مواجهة التحديات

٢٢. مختصر كتاب الكبائر

٢٣. موسوعة الاحكام والفتاوى الشرعية

٢٤. فتاوى علماء البلد الحرام

٢٥. الفتاوي المهه للشيخ عبدالعزيز بن باز

٢٦. الهجره الى بلاد غير المسليمن حكمها ضوابطها وتطبيقاتها

٢٧. المعاكسات الهاننيه من التسلية الى الزنا

٢٨. سوودێكی زۆرم لە سایتەكانی ئەنتەرنێت وەرگرتووە.

٢٩. گۆڤاری چرای ڕووناكی

٣٠. www.veegos.net

٣١. المفصل في الاحكام المراة وبيت المسلم

٣٢. مجموعة الفتاوي لابن تيمة

# ناوەڕۆك

توێژی گەنجان زورترین زەرەر مەندن لەم سەردەمی عەولەمەو تەکنەلوژیایە، گەنجان لەڕێی ئامێرە ئەلکترونیەکانەوە کەوتونەتە گێژاوی شەهوەت و رێی راستی خۆیان بزر کردوە، هیچ ئامانج و ئاواتێکیان نەماوە، یان بەهوی سەرقاڵی بە فیس بوکەکەیەوە نازانێ بۆچی دەژی و لەکوێ هاتوەو بۆ کوێ دەچێ، ئەم گرفتانەی پێش دە ساڵ بەرۆکی گەنجی دەگرت بەتایبەتی گرفتی شەهوەت ئەگەر پیشتر (10%) بو بێت ئیستا گەیشتوتە لوتکەو ریژەکەی یەکجار زیادی کردوە، گەنجی توشی سەرگەردانی کردوە، خێزانی هەڵوەشاندۆتەوە، شوناسی لەدەست داوە.

ئەو کتێبەی بەردەستت بەشێکی زۆری گرفتەکانی گەنجانی بەوردی و بەشێوازی خالبەندی باسکردوە، دواتر بەوەندە نەوەستاوە دەست بەچێ چارەسەری تەواوی بۆ دوزیوەتەوە، توانیویەتی لەماوەی پێشوو گرفتێکی زۆری گەنجان چارەسەر بکات، بەشاهیدی خۆیان، سودێکی راستەوخۆ بەم توێژە بگەیێنێ، بۆ ئەم مەبەستە ئەم کتێبە لەئێستادا لەهیچ پەرتوکخانەیەک نەماوە بڕیارماندا بۆ چاری سێیەم چاپ بکرێتەوە بەئومێدی ئەوەی سودێکی زورتر بەم توێژە بگەیێنێ و ببێتە هەنگاوێکی تر بۆ بەندە لەرۆژی دوایی.

**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com


/TafseerOffice

نرخی 7000 دینار